پەیامەکانی
گەنجان
٢٧

زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان ٤

# رێکەوت لە تەرازووی ژێریدا





موحەممەد مەلا ساڵح شارەزووری




پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

# ڕێکەوت

## لە تەرازووی ژیریدا

نوسینی:

موحەممەد مەلا صالح شارەزووری



زنجیرە پەیامەکانی گۆڤاری رێنوێن ژمارە (٢٧)

- ناوی کتێب: رێکەوت لە تەرازووی ژیریدا
- نوسینی: موحەممەد صالح ئەبوبکر شارەزووری
- ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان
- ژمارەی زنجیرە: ٤
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
- نۆبەی چاپ: یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٤
- ژمارەی لاپەرە : ٧٩ لاپەرە
- دیزاین : رەوشت موحەممەد
- پێداچونەوەی: کۆچەر محمد مەلا صالح
- چاپ : چاپخانەی رێ نوێ
- سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد
- ئیمەیل: renwen٢٠٠٩@yahoo.com
- ماڵپەر: www.aubyc.com

لە بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی ( ١٤٢١)ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە

# پێشەکی

لە رێچکەی بڵاوکراوە کوردییەکاندا لە دەست پێکردنی نوسینی کوردییەوە تا ئەمڕۆ کتێبخانەی کوردی کەلێنێکی گرنگی بێ پڕکردنەوەی مابۆوە.

گرنگی ئەو کەلێنە بە گۆڕین و وەرگرتن نەچەسپی، پێویستی بە کرانەوەی دەست و پەنجەو پێنوسێك هەبوو، بە کەوتنە کاری مێشکێك بە وردبونەوەی بنگایەك، بە بیرکردنەوەی ئاگایەك.

بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە "مامۆستا موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری" کەوتە داوێنی – پشکنین بەلاداکردن بۆ ئەوەی لە تەرازووی ژیریی خۆیدا "رێکەوت" بکێشێ و بیخاتە تەرازووی راستی و گومان لێنەکردنەوە بۆ دۆزینەوەی "پەروەردگار"... بۆ گەڕان بە دووی پزیشکێك لەو رۆژە بێبڕانەوەیە، مامۆستا "شارەزووری" لەم بەراورد کردنی ژیرییەدا لەگەڵ رێکەوت کەوتە کێشە، بەڵام کێشەیەکی بە بەرهەم، شاعیری گەورە "مەحوی" دەفەرموێ:



ژهرێیکی چوون – احاطة – چییە نیسبەتی لەگەڵ
رۆژێکی بێ نیهایەتو بێ چوونو بێ چونان

لە سەرەتای دروست بونی ئادەمیزادەوە تا ئەمڕۆ کێشەو چەڵەمەو وتە نەبڕاوەیە بەرامبەر بە هەڵوێست لە گومانو راستیدا، هەندێ رێگای سەپاندنیان گرتبوو بۆ چەسپاندنی "راستی"، هەندێکیش رێگای لێوردبونەوەو ژیرییان گرتبوو و گرتوشیانە بۆ دەرخستنی راستیی.

ئەم نوسینە شێوە چیرۆکەی مامۆستا "شارەزووری" یەکەم تێکۆشانە بۆ یەکالاکردنەوەی بڕوا بەرامبەر بە یەکسانیو چەسپاندنی "بیری دروستکەر"، سوپاسی خۆهیلاک کردنی دەکرێ دەربارەی گومان نەهێشتنیو رێگای "پاکی" گرتن بۆ ئاسودەیی دەرونو هەموو خوێندەوارێکی کورد بانگکراوە بۆ خوێندنەوەی بە قووڵی نەك بە سادەیی.

**حەمە صالح دیلان**

**سلێمانی**

**١٩٧٥/٥/٥**








## بۆ سەربازی

پــاش نــاو خوێندنــەوەمانو دابەشــکردنمان بەســەر ئۆتۆمبیلەکاندا، بە کاروانێکی سەربازی "القافلة العسكرية" لە هەڵەبجەوە بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتین، لە ئۆتۆمبیلێکی "زیل"ی سەربەتاڵدا خۆمم هەڵسەپاندبوو، پاش بیرکردنەوەیەکی زۆرو رۆچوون لە دەریای ئەندێشەدا، لە پڕ شێوەی یەکێکم هاتە پێش چاو کە سەری شۆڕکردبۆوە بە سەر کتێبێکداو لەبن ئۆتۆمۆبیلەکە لە ترسی هورووژمی با خۆی قایم کردبوو، بە خەمبارییەکەوە دەیخوێندەوە، زۆرم پێخۆش بوو، چونکە لەو باوەڕەدا نەبووم کە خوێندەوارێکی هاودەمم لەگەڵدا بێت، وردە وردە لێ نزیک بوومەوە، سەیرم کرد کتێبەکەی دەستی بە زمانی عەرەبییە پتر لێی نزیک بوومەوە هەتا هەستی پێکردم وتی:

ـ فەرموو کاکە.

ـ سوپاس، فەرموو خوێندنەوەکەت تێك مەدە.

ـ وەرە سەر ئەم سندوقە.






- چوومە سەر سندوقەکەی تەنیشتی‌و دانیشتم ئەویش دیسان سەری شۆڕ کردەوە بەسەر کتێبەکەیداو ماوەیەکی کەم خۆی خەریککرد، لە دواییدا سەری بەرزکردەوە، وتی:

- تۆیش هەر "مکلف"یت؟

- بەڵێ.

- نازانیی بۆ کوێمان دەبەن؟

- بەڕاستیی نەخێر، بەڵام ئەو ئەفسەرەی لە دەزگای "سەربازگریی = تجنید" بوو دەیگوت بۆ "عمارە"تان دەبەن.

- وابزانم هەر وایە.

لەم کاتەدا سەرێکی بۆ دەرەوەی ئۆتۆمبیلەکە بەرز کردەوەو بە دەستیشی دەیویست پاکەتەکەی دەربهێنێ‌و جگەرەیەك داگیرسێنێ.

- فەرموو.

- سوپاس جگەرەکێش نیم.

پاش داگیرساندنی جگەرەکەی‌و مژلێدانی لە ناو دەمە دوکەڵاوییەکەیەوە پرسیارێك دەرهات‌و گوتی:








ـ خەڵکی کوێیت؟

ـ سەیدسادقی شارەزوور.

ـ خوێندەواریت هەیە؟

ـ کەمێك.

ـ ئەمشەو بەندکرایت؟

ـ نەخێر، چونکە ئۆباڵدار "کفیل" م دابوو.

ــ زۆر باشــە، کەواتــە دەبــێ هــۆگری یــەکتریی بــین، ئــەوەیش"ج"ی پورزامــەو مــن نــاوم "کاوەیــەو خــەڵکی هەورامانم".

بەڵێ بەو جۆرە لەگەڵ تازە هاوڕێی نێو "زیــل" واگەیشــتینە سلێمانیی لەوێوە بۆ کەرکوك، بۆ بەیانی بۆ بەغداو لەوێشەوە بۆ عمارە.

ـ کاك کاوە شتومەکت وەرگرت؟

ــ تــەنیا یــەك پــەتوو و "بێرییــە"یــەکی ســەرو جووتێــك "پۆستاڵ" و دەڵێن دەبێ بەیانیش پێش مەلابانگدان دەرچن بــۆ مەشق.





 

ـ مەشق؟! مەشقی چی؟

ـ ئەو "عریف"ە رەشە دەڵێ، وا بزانم ناوی "رۆمـی عذافـة" یە.

ـ کەواتە لە ئەمرۆوە بۆمان دەژمێررێت بۆ سەربازی؟

ـ بەڵێ، کەواتە با بنوین شەو درەنگە، نەك بەیانی خەبەرمان نەبێتەوە.

ئەو شەوە بـەناو نوسـتین، بـەیانی زوو هەڵسـتام بـۆ ئـەوەی دەستنوێژ بشۆم، چونکە دەترسام کە بانگ درا ئیتر نـەهێڵن بـە ئاسانیی نوێژەکەم بکەم، دەستنوێژم گرتبوو، لە سەر حەسیرێکی تەنك دانیشتبوم چاوەڕوانی بانگم دەکرد، ئەوەنـدەم زانـی کـاك کاوە لە ژێر پەتووەکەیەوە سەری هەڵبڕی وتی:

ـ دەئیتر ئەم نوێژە نەبڕایەوە؟ وا نەختێکی تر هەڵماندەسـێنن بۆ گۆڕەپانی مەشق.

ـ کاك کاوە وا نییە، ئادەمیزاد هەموو کاتێ ئاتاجی خوایەو نابێت خوای لە یاد بچێت.

ـ خوا خوا... خوای چی؟






ـ ئەو خوایەی ئـەم بونـەوەرەی دروسـتکردوەو ئێمـەی تێـدا دەژین.

به دەم سەر داپۆشینەوەو خۆپێچانەوە بە پەتووەکەیەوە وتی:

ـ لێت ناگرم، چونکە مامۆستا مەلا "ع" دەرسی وا داویـت.

الله اکبر... الله اکبر...

هێشتا لە نوێژەکەم نەبوبومەوە کە "نائب عریف حمـه فقـی" بە دارێکەوە بەربووە قاچو قولی سەربازەکانو دەسـتی کـرد بـه "انهض انهض".

ـ کاك کاوە ئەمرۆی سەربازیشـمان تـەواو بـوو، وا "دەوام" خەریکە تەواو دەبێت، با وردە وردە بەرەو گوێی روباری "دجلە" برۆینو نەختێك لە گوێی ئاوەکە دانیشین.

ـ زۆر باشە فەرموو.

پاش رۆیشتنمان بۆ سـەر ئاوەکـەو گورینـەوەی چـەند وتـوو وێژێك:

ـ بە راستی کاك کاوە زۆر دڵخۆشم بە هاورێتی ئێوە، سوپاس بۆ خوا، بەڵام...







ـ بەڵام چی؟ توخوا تەواوی بکە.

ـ دەترسم دڵت گەرد بگرێت.

ـ نە بە سەری تۆ دڵم گەرد ناگرێتو زۆرتر دڵخۆش دەبم کە لە هەموو شتێکدا بەرامبەر یەکتر راستو رەوان "صریح" بین.

ـ منیش ئەوەم دەوێت، راستییەکەی سستیی بەرێزتان لە روی ئایینیەوە مایەی دڵتەنگیمەو حەزیش دەکەم هۆیەکەی بزانم.

ـ چۆن تۆ دەڵێیت وادەکەم، حەزدەکەی نوێژیشت بۆ دەکەم.

ـ بۆ من؟

ـ بەڵێ بۆ تۆ، چونکە دڵی تۆم زۆر دەوێتو نامەوێ برەنجێت، ئەگینا من...

ـ بۆچی؟!

ـ راستییەکەی من لام وایە بونەوەر "کون" بە رێکەوت دروست بووە کە راستیش دەکەمو زانستیشم لەگەڵدایە، بەڵام توخوا تۆ زویر مەبە من وا دەزانم کە ئایین بریتییە لە ئەندێشەیەك دەوڵەمەنەکان دروستیان کردووە بۆ ئەوەی سواری







هەژارەکان بىن پێی‌و ژیانیان لێ بسێنن، بە کورتی من بە چەکی دەستی دەوڵەمەندی دەزانم بۆ گیانی هەژارەکان‌و بڕوام بە نادیار "غەیب" و مەیی نییە! چونکە زانست گاڵتە بەم جۆرە شتانە دەکات‌و بە داخەوەم بۆ تۆو لاوێکی وەك تۆ کە چاوو‌ڕاوت لێکراوەو راستیت لێشاراوەتەوە.

ـ نەك زویر نابم، بەڵکو سوپاست دەکەم لە بەر دوو هۆ:

یەکەم: سەربەست بویت لە دەربڕینی رازی دڵت.

دووەم: تەمەڵ نیت، چونکە زۆربەی بە ناو موسڵمانەکان هەموو باوەڕێکی راستییان هەیە کەچیی لە بەر تەمەڵی وازیان لە ئایینەکەی خۆیان‌و نەریتیی چەند ساڵەیان هێناوە، بەڵام ئەوەی تۆ کردوتە بە بەڵگە، تەنیا بەڵگەی دەستی تۆ نییە، بەڵکو زۆربەی لاوەکانی ئەمڕۆمان بە پێشێل کردنی راستیی و تێنەگەیشتن لە راستیی زانیاریی‌و تاوانبار کردنی زانیاری بێتاوان ئەمەی تۆ بەڵگەیانە. جا لە بەر ئەوەی بە هاوڕێت دەزانم‌و بەختیاری تۆم دەوێ، ئەگەر ماوەم بدەیت‌و سەرت نەئێشێت حەز بەوە دەکەم ئەم بەڵگانەی بەڕێزتان بە پێی







زانیـــاری کـــەمی هـــەردوکمان‌و ئـــەو کتێـــب و زانیارییانـــەی بەرچـــاومان کـــەوتوە بخەینـــە ژێـــر وردبـــین (میکرۆســـکۆب)ی ژێرییەوە، تـــاکو راستیمان لـــێ ون نـــەبێ‌و تـــۆیش لـــەوە زیـــاتر بەزەییت بە مندا نەیەتەوە.

- ئێمەی دەربەدەرو دوور لە هـــەموو کـــەس‌و کـــارو دوور لـــە هەموو کتێبخانەیەك ئەگەر رۆژانمان بەم جۆرە شتە بە کەڵکانـــە بـــە ســـەر بـــەرین گـــەلێ چـــاکترە، بـــەڵام توخـــوا باســـی ئـــاین‌و مامۆســـتای ئـــایینم بـــۆ مەکـــە، چـــونکە نـــەزانترین گـــەل‌و دواکەوتوترین گەل گەلانی موسڵمانی ئەمڕۆمانە.

- لەگەڵتم... راست دەکەیت، بەڵام نەك تەنیا ئیسلام، بەڵکو هەموو ئایینێك، لەم رۆژەدا رۆڵەکانی بە شارەزایی ئـەو ئایینـە وەرناگرن‌و لێی ناکۆڵنەوە، بەڵکو ئەگەر بەچکە گاور بوو گاورە، بەچکە جوو بوو جووە، بەچکە موســڵمان بـــوو بـــەپێی ســـەرنامە "دفتر النفوس" موسڵمانە، بێ ئەوەی هیچ لـەم ئایینـە بـزانن، بەڵکو شارەزاییان لە بیرو باوەڕەکانی تردا زیاتر هەیـە، کەواتـە ئیسلام جیایەو موسڵمان جیایە، ئیسلام شتێکی ترەو موسڵمان



شتێکی تره، "جەمالەددینی ئەفغانی" له کاتی خۆیدا گوتویەتی: "ئەگەر بمانەوێ رۆڵە سەربەستەکانی ئەورووپا بانگ بکەین بۆ ئیسلامییەت دەبێ لە پێشدا بڵێین خۆمان موسڵمان نین، چونکە ئەوان لە ئێمەوە سەیری قورئان دەکەن و کە سەیریش دەکەن چی دەبینن؟ گەلێکی نەزان و نەخوێندەوارو چەقیوی ناو قوڕی ئەفسانە، کاتێ ئێمە بەو جۆرە دەبینن دەڵێن ئەگەر ئەم کتێبە (قورئان) راست بوایە شوێنکەوتەکانی بەو جۆرە دواکەوتوو نەدەبون".

جا بۆیە پێت دەڵێم کە ئیسلام زۆر دوورە لە ئێمەی بە ناو موسڵمانەوە، ئێمە باسی ئیسلام دەکەین، نەك موسوڵمان. .

ـ باشە فەرموو.

ـ تۆ دەفەرمویت:

یەکەم: بونەوەر بە رێکەوت و لە خۆیەوە دروست بووە.

دووەم: ئاین چەکی دەستی دەوڵەمەندە بۆ گیانی هەژاران.

سێهەم: زانیاری گاڵتەی بە "غەیب و مەیب" دێ.







ئەوەی بەلای منەوە گرنگ بێت‌و بمەوێ زۆرتر لەگەڵت بدوێم بیانوی یەکەمتە، بەسەر پێیەکەوە بۆ دووەم بەڵگەت پێ دەڵێم: ئاین‌و بیروباوەڕی ئایینی لە کاتێکدا هاتووە کە نە سەرمایەداریی هەبووەو نە دەرەبەگ‌و نە خاوەن دارایی، ئاین هەر لە یەکەمین قۆناغی کۆمەڵایەتی ئادەمیزادەوە هەبووە، پێش ئەوەی چینایەتی لە نێو ئادەمیزاددا دروست ببێت، وا بزانم مێژووش لایەنی من دەگرێت، ئێستاش وا بڵێسەی ئاگری سەرمایەداری خەریکە لە جیهاندا دادەمرکێت ئاین هەروەکو خۆی ماوەو ئەرکی سەرشانی خۆی لە ناو گەلی بێچینایەتیدا بەجێ دەهێنێ، ئەمە بۆ بەڵگەی دوهەمت‌و لە وەڵامی بەڵگەی سێهەمیندا دەڵێم، راست نییە کە دەڵێی زانیاری لاقرتیی بە نادیار دەکات، چونکە زانیاریی خۆی تا بینەقاقەی لە ناو نادیاردا چەقیوە ئیتر چۆن گاڵتەی پێدەکات؟

ـ زانست لە ناو غەیبدا چەقیوە، چۆن!؟ زانست دەڵێ: ئەوەی نەچێتە ژێر وردبین "میکرۆسکۆب"ەکەمەوەو نەیبینم بە بونی دانانێم.





ـ راست ناکەیت، وا نییە، زانیاریی باسی هێزی ڕاکێشانی "جاذبیة" دەکات بێ ئەوەی بیبینیێ، یان باسی ئەلیکترۆن دەکات یان باسی شەپۆلەکانی بێتەلو رادیۆو تەلەفزیۆن دەکات، یان باسی کێشەری موگناتیسی دەکات بەبێ ئەوەی هیچ لەم یەکێك شتانە ببینیێ.

بەڵام وەکو لە پێشەوە پێم وتیت هەمووی هۆی یەکەمین بیانوتە کە بەرچاوی گرتوی، ئەگەر باوەڕت هەبوایە بەوەی کە یەکێك ئەم بونەوەرەی دروست کردووە ئەوا بەو جۆرە تووشی نەخۆشی ڕێکەوت نەدەبویتو ئەم سەرلێشێواوییەت بەسەردا نەدەهاتو بەو جۆرە بێباوەڕ نەدەبویت.

جا وا کاتمان تەواو بوو نزیکی لێدانی بەشە خواردن "قصعە"یش هاتووە بالێرەدا باسەکەمان بە جێبهێڵین بۆ بەیانیو تا سبەینێ سەعات دوو نیو خوات لەگەڵ.







## نرخی رێکەوت لە بارەگای زانیاییدا

ـ کاك کاوە وا کاتژمێر دوونیوەو وا بزانم کاریشـت نییەو منیش هەندێك بەرگی سەربازیم وەرگرتووەو قۆپچەکانی ...، با بڕۆین بۆ سەر روبارەکەو بە دەم گفتوگۆوە ئەم قۆپچانەش دەدورمەوە.

ـ زۆر باشە فەرموو.

پاش ماوەیەك دانیشتن لە سەر رووبارەکە گوتم:

ـ با لە سەر باسەکەی دوێنێمان بڕۆین.

ـ فەرموو، منیش خۆشحالّم.

ـ فەرموتان بونەوەر بە رێکەوت دروست بووە؟

ـ جا بۆ تۆ وادەزانی کە رێکەوت بەپێی هۆش (عقل) ناقەومێتو نابێت؟ بڕوات بە رێکەوت نییە؟ وا دەزانی ئەستەمە "مستحیل"؟

ـ دەتوانین بلّێین بەلّێ ئەستەمە "مستحیلە" و دەتوانین بلّێین نا، ستەم نییە، بەلاّم ئەگەر شێوەی پرسیارەکەت بگۆڕیتو بلّێی:







ئایا نرخی رێکەوت لە بارەگای زانیارییدا چەندە؟ باشترە.

ـ باشە ئایا نرخی رێکەوت لە بارەگای زانیارییدا چەندە؟

ـ زۆر باشە، فەرموو یەك... دوو... سێ...

ـ ئەوە چییە دەرزیم بۆ چییە؟!

ـ ئەو "دە" دەرزییە بگرە، یەکێکیان بچەقێنە بە زەویداو نوکی یەکێکی تریان بکە بە کونی دەرزی داچێنراودا، ئێستا ئەگەر یەکێك کە ئاگای لە چۆنێتی ئەم کارە نەبێت‌و بلێ: ئایا ئەم دەرزییە چۆن کراوە بە کونی ئەوەی تردا؟ بۆ وەڵامەکەی دوو کەس کە هەردوکیان لە ناو کۆمەڵدا بە راستگۆ ناسرابن، وەڵامیان دایەوە، یەکەمیان وتی: پیاوێکی لێزان لە دوری (١٠) مەتر ئەم دەرزییەی فڕێداوەو چوەتە ناو کونی ئەوی ترەوە... دووەمیان وتی: "نا، منالێکی کوێری زگماك فڕێیداو چووە کونی ئەوی تریانەوە. ئایا کامیان راست دەکەن؟

ـ ژیریی دەڵێ: پیاوی یەکەم راست دەکات، بەڵام رێگای راستیی پیاوی دووەمیش هەیە.



ـ ئەی هەر بەم شێوەیە دەرزی سێهەمیش کرابوو بە کونی دەرزی دووهەمدا ئێستا کامیان راستتر دەکەن؟

ـ وتەی پیاوی یەکەم دڵباشتر دەیگرێت، بەڵام هەر لەوانەیە وتەی پیاوی دوهەمیش راست بێت.

ـ ئەی ئەگەر ئەو (١٠) دەرزییە بەم شێوەیە هەریەکەیان کرابێت بە کونی ئەوی تردا، ئایا نرخی رێکەوتەکەی پیاوی دووەم دەمێنێ؟

ـ نەخێر... بەڵام...

ـ بوەستە... خۆ ئەگەر یەکێك لەو مرۆڤانەی خوا لە ئاستیان دەفەرموێت: (وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا)... هاتو وتی: ئەستەمی ژیریی (المستحیل العقلی) جیایە لەگەڵ ئەستەمی ئاسایی (المستحیل العادی) لەوانەیە پیاوی دووهەم راستتر بکات تۆ دەڵێی چی؟

ـ بڵێم چی؟!

ـ ئێ، با بڵێین راست دەکات، ئەی ئەگەر ئەم (١٠) دەرزییە هەریەکەیان ژمارەیان لێدرابوو لە (١) وە هەتا (١٠) بۆ هەر



دەرزییەك ژمارەی تایبەتی خۆی و بەم جۆرەیش کرابوو بە کونی یەکتردا و هەر ئەم پیاوە زۆر بلێیە وتی: ئەم دەرزییانە لە تورەکەیەکدا بون‌و منالێکی کوێر دەستی کرد بە ناو تورەکەکەداو بە رێکەوت هەر یەکەیان بەپێی ژمارەی خۆی یەك لەدوای یەك هەموو دەرزییەکانی دەرهێناو هەڵیدان کەچی هەر بە رێکەوت چونە کونی یەکترەوە ئا بەم شێوەیە کە دەبینی و ئەم پیاوە هەوڵی تاشینی بەڵگەی دەدا بۆ سەلماندنی وتەکەی، ئایا بڕوای پێدەکەی؟

- دیارییە؟ نەخێر، چونکە جێگای بڕوا نییە.

- ئایا دەزانی بۆچی بڕوای پێناکرێت؟ باپێت بڵێم.

- فەرموو.

- هەر کاتێك ژمارەی شتی تێکەڵاو کەم بێت ئەوە رێژەی رێکەوت زیاد دەکات‌و بە پێچەوانەوە کەم دەکات، واتە ئەگەر دوو شت بون ئەوە رێژەی رێکەوت وەك یەکێك دژی دوو بوەستێ وایە، خۆ ئەگەر (١٠) شت بون، بۆ هەر یەکەیان وەکو (١) بێت دژی (١٠) وایە، چونکە هەریەکەیان ماوەی دەرچونی هەیە وەك







ئەوی تر بێ زیادو کەم، خۆ ئەگەر زیاتر بێت، ڕێـژەی ڕێکـەوت نەك کەم، بەڵکو هەر نامێنێ، ئێستا بڵێین منداڵە کوێرەکە یەکەم دەرزیی بە پێی ژمارەی خۆی دەرهێنا وەکو یـەك دژی دە وایـە، بەڵام ئەگەر دەرزیـی (١و ٢)هـەمی دەرهێنـا وەکـو یـەك دژی "سەد" وایە، چونکە هەریەکەیان جەنگ لەگـەڵ خانـەی یـەکان دەکات کەواتە دژی سەد دەگرێتەوە. وە ئەگەر منداڵەکە (١ و ٢ و ٣) هەم دەرزیی هـەر یەکـەیان بـەپێی زنجـیرەی ژمارەکـانو بەسەر یەکەوە دەرهێنا، ئەوە ڕێژەی ڕێکـەوت وەکـو یـەك دژی هەزار وایە، خۆ ئەگـەر هـەر (١٠) دەرزییەکـەی بـە ڕێکـەوت دەرهێنـا بـەپێی ژمـارەی خۆیـانو یـەك لـە دوای یـەك هـەر بە"ڕێکەوت" ئەوە یەك دژی دە ملیار دەوەستێ...

ـ دە ملیار!؟

ـــ بـەڵێ ئەمـە تـەنیا دەرهێنـانی دەرزییـەکان لـە نـاو تورەکەکەدا، ئـیتر بێجگـە لـە هەڵـدانو چـەقین بـە ڕێکـەوت. فەرموو ئەوە پێنوسو ئەوەیش پشتی پاکەتەکە لێکی بدەرەوە.

ـ بەڵێ ڕاستە.








ـ قەیدی نیە، ئەمەش هەر ڕێی تێ دەچێت‌و لەوانەیە ڕاست بکات، شتێکی تر.

ـ فەرموو.

ـ ئەگەر تۆ خاوەنی چاپخانەیەك بیت‌و ئەو چاپخانەیە نیو ملیۆن پیتی تێدابێت، یەکێ لە کرێکارەکانی چاپخانەکەت هات‌و وتی:

ئەمشەو بومەلەرزەیەکی گەورە قەوماو هەموو پیتەکانی چاپخانەو کاغەزو کلێشەکان هەمویان تێکەڵاو بون‌و پژان بە سەریەکداو لەم تێکەڵاو بونە بە ڕێکەوت ڕستەیەکی ماندار کە لە (١٠) وشە پێکهاتبێ چاپ بووە، ئایا بڕوای پێی دەکەیت؟

ـ دەتوانم بڵێم بەڵێ، هەر چەندە نەختێك زەحمەتە.

ـ ئەی ئەو کرێکارە بڵێت:

هەر بە هۆی ئەو بومەلەرزەوە دیوانێکی شیعر بە ڕێکەوت چاپ بوو کە لە هەموو رویەکی وێژەوانییەوە تەواوە و لە ئەوپەڕی وردەکاریدایە لە ڕووی کێش‌و سەروا "قافیە"و ماناو



ڕێزمانەوەو هیچ نارێکیی تیا نییەو پتر لە (٥٠٠) لاپەڕە، ئایا بڕوای پێ دەکەیت؟

- نەخێر.

- بۆچی؟

- چونکە درۆکەی دیارەو بە هیچ شێوەیەك جێگای باوەڕ نییە.

بەهۆی بومەلەرزەکەیەوە چۆن کتێبێك بەو شێوەیەو لە (٥٠٠) لاپەڕە پێکهاتبێ چاپ دەبێت!؟

- باپێت بڵێم بۆچی نابێت، ئەگەر دەرهێنانی (١٠) دەرزیی ژمارە لێدراو یەك لەدوای یەك بریتیی بێت لە یەك دژی (١٠) ملیار، ئەی دەبێ (١) دژی (چەند) بوەستێت بۆ دروست بونی کتێبێك کە (٥٠٠) لاپەڕە بێتو هەر لاپەڕەی بەلای کەمەوە (٨٠٠) وشەی ڕێكو پێکی تێدابێت، لێرەدا نرخی ڕێکەوت دژی چەند ژمارەیەکی زۆر زۆر زۆر کاك کاوە ئەگەر بڵێیت ملیار ملیار ملیار هێشتا هەر کەمە.






پاش ماوەیەك بێدەنگیی بۆم دەركەوت لە وتەكانم تێگەیشتووە، وتم:

ـ بەڵێ كاكە گیان ئەمە بۆ كتێبی چاپخانەیەك كە وشەكانی بە تەزبیحی دەستی یەكێك لە سۆفیەكانی بیارە دەژمێردرێت، ئەی چیی دەڵێیت بۆ كتێبی خواو وشەی خوا؟ كە خۆی دەفەرموێت: (قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً) (الكهف: ١٠٩) واتە: موحەممەد بڵێ بەبێ بڕواكان ئەگەر ئاوی هەموو دەریاو زەریاكان ببن بە مرەكەبو وشەكانی خوای پێ بنوسرێتەوە، دەریاو زەریاكان وشك دەبن پێش ئەوەی وشەكانی خوا تەواو بن، ئەگەر ئەوەندەی تریش دەریا بهێنن بۆ نوسیینەوە، هەر وشەكانی خوا تەواو نابن.

هەروەها دەفەرموێت: "وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّه" (لقمان: ٢٧) واتە: ئەگەر هەرچی درەخت هەیە لە سەر ڕوی زەوی بكرێن بە پێنوسو دەریاو حەوت دەریای تریش ببن بە




مرەکەب‌و وشەکانی خوای پێ بنوسرێتەوە، هێشتا وشەکانی خوا هەر تەواو نابن.

ـ مەبەست لە کتێبی خواو وشەی خوا "قورئان" نییە؟

داواکارم بە چاوێکی بەرزتر سەیری قورئان بکەیت‌و زیاتر بۆی ڕۆبچیت، نەخێر مەبەستی خوا قورئان‌و وشەکانی قورئان نییە، قورئانێکی کەمی دیاریکراو و نوسراو لە چەند لاپەڕەیەکی کەمداو دەخوێنرێتەوە لە ماوەیەکی کەمدا، کەی نوسینەوە پێویستی بە حەوت دەریا هەیە؟ نەخێر مەبەستمان لە بونەوەرە.

چۆن وشەکانی خوا تەواو دەبێت کە هەمرو ئەتۆمێك لە ئاوی دەریاکان‌و هەموو کلۆرۆفیلی درەختەکان‌و درەختەکان خۆیان وشەی خوان، بە لکو هەموو بونەوەر لە ئاتۆم، ڕەگەزایەتی، یاسا، ڕژێم، ڕێژە، پەیوەندیی، قەوارە، تۆپەڵە، بارستایی، کێش، ماوە، کات، وێنە، شێوە، ڕەنگ، دانیشتن‌و هەڵسوکەوت، چۆنێتیی‌و جۆر...هتد، وشەی خوان، بەڵێ وشەی (خوا)ن.



جا ئێستا کەوتینە سەر باسەکەمان، فەرموو لەگەڵم با هەندێکی کەم بە چاوی هۆش‌و ژیرییەوە سەیری هەندێ لە دروستکراوەکانی خوا بکەین هەتا بزانین ئەم بونەوەرەی ئێمەی تێدا دەژین چۆنە؟

هەر لە پەیوەندی نێوان پارچەکانی‌و ئەندازەو یاساو جوڵانەوەو... هەتا دواییەوە، پێشەکیی با نەختێك گوێ رایەڵێن بۆ قورئان‌و بزانین چیی دەفەرموێت، جا دوایی بەراوردی بکەین لە وتەکانی زانیارییدا هەتا بزانین نرخی رێکەوتەکەی بەرێزتان بەرانبەر بە هاوسەنگی دروست بونی بونەوەر چەندە؟

خوا دەفەرموێت: "إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ" (القمر: ٤٩) واتە: ئێمە (خوا) هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردووە.

هەروەها دەفەرمێت: "وَكُلُّ شَيْءٍ عِندَهُ بِمِقْدَارٍ" (الرعد: ٨). واتە: هەموو شتێك لای خوا بە ئەندازەیە.

هەروەها دەفەرموێت: "أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ" (الأعراف: ١٨٥) واتە: موحەممەد تۆ بڵێ با سەیری ئاسمان‌و زەوی بکەن‌و بزانن چییان تێدا هەیە.



هەروەها دەفەرموێت: "وَكَأَيِّن مِّن آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ" (يوسف: ١٠٥). واتە: هەر نیشانەیەکی بونی خوا بکەوێتە بەر چاوی بێباوەڕەکان لە ئاسمان یان لە زەوی ئەوان رووی لێهەڵدەچەرخێنن.

هەروەها دەفەرموێت: "أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئاً" (مريم: ٦٧). واتە: ئەوە بۆ ئادەمیزاد لە یادی نایەت کە ئێمە دروستمان کرد لە بون بێ ئەوەی لە پێشدا شت بوو بێت.

هەروەها دەفەرموێت: "فَلَا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ * وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ" (الواقعة: ٧٥ ـ٧٦). واتە: سوێند دەخۆم بە رێ‌و شوێنی "مەڵبەندی" ئەستێرەکان کە ئەمەیش سوێندێکە ئەگەر بزانن زۆر گەورەیە... بەڵێ کاک کاوە زۆر گەورەیە.

هەروەها دەفەرموێت: "وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ" (النمل: ٨٨). واتە: هەر کە کێوەکان بەدی



دەکەیت وا دەزانی وەستاون، کەچیی لە راستیدا نەوەستاون، بەڵکو وەك پەڵە هەور دەڕۆن.

هەروەها دەفەرموێت: "وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً" (الإسراء: ٨٥). واتە: بێباوەڕەکان پرسیاری چۆنێتی "گیان"ت لێدەکەن، تۆیش پێیان بڵێ: گیان لە فەرمانە نادیارەکانی خوایە ئێوە ناتوانن بزانن چییە، ئێوە زانیارییەکی کەمتان دراوەتێ... بەڵێ کاك کاوە ئادەمیزاد هەرچەند زانا بێت هەر زانیاری کەمە.

هەروەها دەفەرموێت: "أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ" (الأنبياء: ٣٠) واتە: ئایا بێباوەڕەکان سەیر ناکەن ئاسمانو زەوی یەك تۆپەڵە بونو لە دواییدا جیامان کردونەتەوە، پەیوەندی ژیانی هەموو زیندەوەرێکمان بەستووە بە ئاوەوەو بە هۆی ئاوەوە زیندون، ئیتر بۆ باوەڕ ناهێنن بە خواو خۆیان گێل دەکەن؟ کاك کاوە ئەوەش بزانە کە موحەممەد ﷺ



بیردۆزیی سەدییەکانی نەخوێندوەو " سێر جێمس جێنز"یشی نەدیوە.

یان دەفەرموێ "ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ" (فصلت: ١١). واتە: کاتێ خوا ویستی ئاسمان دروست بکات دووکەڵ "هەڵم" بوو ئایا زانستەکەی سەدەی بیستیش هەروا نالێ؟

ئەمەی پێشەوە هەندێك بوو لە وتە پیرۆزەکانی قورئان، ئەو قورئانەی هاتۆتە خوارەوە بۆ "موحەممەد"ێکی نەخوێندەوارو پەروەردەی ناو نەزانترین گەلی ئەو سەردەمەو دوور لە هەموو شوێنە زانیارییەکانی ئەو کاتەی وەك "ئەسکەندرییەو ئەسیناو شام"، نەك تەنیا خۆی خوێندەواریی نەبووە، بەڵکو لەو ناوچەیەشدا خوێندەوارێکی ئەو تۆی تێدا نەبووە.[1]

کەچی لەم سەدانەی دواییدا بەهۆی زانستی نوێوە وردەکاری قورئانو پلەو پایەی بەرزی قورئانمان بۆ دەردەکەوێت.

---

[1] دلوا کارم خوا یارمەتیم بدات بۆ چاپکردنی کتێبی "ئایا قورئان دانراویی محمدە" زۆر شتی ترمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئێستا نەزاندراوە.



جارێ با ئەم فەرمودانەی قورئان لێرەدا بەجێ بهێڵینو بڕۆین بۆ سەیری نوسراوەکانی زانستی بەراوردێکی ژیرانەیان بکەین لەگەڵ فەرمودەکانی قورئاندا بۆ دۆزینەوەی راستیی.

وا کاتیشمان تەواو بوو نەوەك فریای بەشەخۆراکی "قصعە"ی ئێوارە نەکەوین، تا سبەینێ سەعات (٢,٥)ی پاش نیوەڕۆ خوات لەگەڵ.




## ئاسمان

(سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ) (فصلت: ٥٣)

ـ جا ئێستا کاك کاوە کام زانیاری بدەینە بەر تیشکـ ـت هەتا جێگای دەستی تاقە خوامان بۆ دەربکەوێ؟

ـ ئارەزووی تۆیە.

ـ کەواتە با نە بە ئارەزوی من‌و نە بە ئارەزوی تۆ بێت، بەڵکو با بە ڕێبازی قورئان بڕۆین، چونکە قورئان هەر کاتێك داوای وردبونەوەی دروستکراوەکانی خوا لە مرۆڤ دەکات لە ئاسمانەوە دەست پێدەکات وەك دەفەرموێت: (أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ" (الأعراف: ١٨٥) واتە: ئەوە بۆ سەیری دروستکراوەکانی خوا ناکەن لە ئاسمان‌و زەوی‌و بزانن چەند شتی سەرسوڕهێنەری دروستکردوە.

ـ باشە بۆ ئاسمان، فەرموو سواری ئۆپۆللۆی ئەندێشە ببە.

ـ جا ئێستا کاك کاوە باسی کام ئاسمانت بۆ بکەم؟ ئەم ئاسمانەی خوا بەو جۆرە بە گرنگیی ناوی دەبات‌و زانستی نوێ بۆی دەرکەتووە، ئەو کاتەی کە قورئان هاتووەتە خوارەوە






گرنگیی ئەم ئاسمانە بەم جۆرە بە ئەندێشـەی کەسـدا نـەهاتووەو نەیانزانیوە کە ئاسمان ئەوەندە فراوانە.

جا هەروەك لە جوگرافیادا خوێندوتە تیشـك لـە یـەك چـرکە (پانیـە)دا مـاوەی (١٨٦) هـەزار میـل یـان (٣٠٠) هـەزار کیلۆمەتر دەبڕێت، هەروەها لـە یـەك خولـەك (دقیقـە)دا (١١ ملیۆنو ١٦٠ هەزار میل) دەبڕێت، هەروەها لە ساڵێکی ئێمەدا تیشك ماوەی شەش ملیۆن ملیۆن واتـە نزیکـەی شـەش هـەزار ملیار میل دەبڕێت.

ئەم ماوە ناو نراوە بە ساڵی تیشـکی (السـنة الضـوئية)، بـۆ ئەوەی بتوانین ئاسمانی پـێ بپێـوین، واتـە ئەگـەر وتیـان فلاّنـە ئەستێرە یەك ساڵی تیشکی لە فیسارە ئەسـتێرەوە دورە مانـای ئەوەیە شەش هەزار ملیار میل لێیەوە دورە.

کاك کاوە مانگ نـزیکترین پارچـەی ئاسمانییـە لـە ئێمـەوە، تیشـکەکەی بـە کـەمتر لـە دوو چـرکە دەگاتـە زەوی، چـونکە (٢٤٠) هەزار میل لێمانەوە دوورە، بەڵام خۆر لـە مـاوەی (٨) خولەك (دقیقە)دا تیشکەکەیان دەگاتێ، چـونکە (٩٣) ملیـۆن



میل لێمانەوە دوورە، بەڵام ئایا دەزانی کە ئێمەو مانگو کۆمەڵەی خۆر "المجموعة الشمسية" هەموویان دراوسێو زۆر لە یەکەوە نزیکین؟ دورترین ئەستێرە "داڵی فڕیو = النسر الطائر"ە، کە ماوەی (١٤) ساڵی تیشکی لێمانەوە دوورە.

ـ بە خوا زۆرە (١٤) ساڵی تیشکیی؟!

ـ ئەمەش هیچ نییە، لە دوای ئەمەوە ئەستێرەی "داڵی نیشتوو = النسر الواقع" دێت کە (٣٠) ساڵی تیشکیی لێمانەوە دورە دوای ئەمانیش ئەستێرە هەیە کە هەزار ساڵی تیشکیی لێمانەوە دورە، ئەمانەش هەموویان لەگەڵ خۆمان لە یەك کەشکەشان "مجرة" دا دەژین کە پێی دەگوترێت کەشکەشانی رێگای کاکێشان (مجرة درب التبان) و لە دوای ئەم کەشکەشانی خۆمانەوە (سدیم) هەیە وەك "سەدیمی رستە ژنە = سديم المراة المسلسلة" کە یەك ملیۆن ساڵی تیشکی لێمانەوە دوورە، لە دوای ئەم بە هەزاران سەدیمی تر هەیە، بەڵام نایەنە ژێر زانستی زاناکانی سەدەی بیستەوە، بەسە بۆ فراوانیی ئاسمان کە خوا دەفەرموێت: "وَالسَّمَاء بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ"



(الـذاريات: ٤٧) ئەوەتـە ئاسمانمـان دروسـت كـردووە بـە هێـزو بەردەوامین لە سەر پانو پۆڕ كردنی. ئەمە بۆ فراوانـی ئاسمـان، بەڵام ئایا ژمارەی ئەستێرەكان چەندن؟

جاران بە هەزار ئەستێرەیان دەژمارد، لـە دوایـیدا بـە ملیۆنو ملیار دەیانژمارد، بەڵام ئێستا زاناكان دەڵێن هەر تەنیا ئەم كەشكەشـانەی ئێمـە تیایـدا دەژیـن پـتر لـە (٣٠) ملیـار ئەستێرەی تێدایە و چەند كەشكەشانی تر هەن لە دوای ئەمـەوە كە تا ئێستا (٥٠٠) كەشكەشانیان دۆزیوەتەوەو زاناكان دەڵـێن ئەگـەر ئـامێری چـاكتر هـەبێ لەوانەیـە پـتر لـە ملیۆنێـك كەشكەشانی تر هەبێت.

كاك كاوە، قورئان دەفەرموێت "وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ" (یس: ٣٨) واتـە: خـۆریش خـول دەخـوات لـە خولگـەی خۆیـدا، ئەوەیـە فـەرمانی خـوای بـە دەسـەڵاتو زانـا، هـەروەها دەفـەرموێت: "وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ" (یس: ٤٠) واتە: هەموو ئەستێرەكان هەریەكەیان لـە گەردونی خۆیدا مەلەوانیی دەكا.



کاکە گیان چەند سەدە دوای پێغەمبەر ﷺ زاناکان وایان دەزانی ئەم ئەستێرانە ماون لە جێگای خۆیانداو ناجولێن‌و پێیان دەوتن "کۆمەڵی ئەستێرە چەسپاوەکان = الثوابت" کە هەتاویش یەکێك بوو لەو کۆمەڵە، بەڵام لە دواییدا زانست سەلماندی کە قورئان راست دەکات‌و زاناکانی دوای پێغەمبەر ﷺ بە هەڵە چوون. زانست سەلماندی نە خۆرو نە هیچ ئەستێرەیەك وەستاو نییە، بەڵکو هەموویان مەلە دەکەن، بەڵێ لە دەریای بێبنی ئاسماندا مەلە دەکەن‌و هەریەکەیان شوێنی تایبەتی مەلەکردنیان بۆ دیاری کراوەو کەسیان لە کەسیان ناکەون‌و هەتا جیهان دەمێنێت. ئافەرین رێکەوت بۆ خۆت‌و ئیشت!

- بۆ خۆریش دەگەڕێت؟

- بەڵێ، ئەی ئەوە نییە قورئان دەفەرموێت: "وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا" (یس: ٣٨) زانست هیچ کاتێك دژی قورئان نەوەستاوەو بۆ زاناکان دەرکەوتووە بەبێ هیچ گومانێك کە خۆر لە ماوەی (٢٦) رۆژی ئێمەدا جارێك بە دەوری خۆیدا دەسوڕێتەوە.



- دەی دەی من زۆر حەزم لە باسی گەردونزانییە بە تایبەتی کە ئەم باسەیش پەیوەندی هەیە بە فەلسەفەوە.

- چیت بۆ باس بکەم، کتێبێکی گەردونناسیی "فلکی" بکڕەو بیخوێنەرەوە بزانیت ڕێکەوت چەند بە دەسەڵاتو هێزەو تاکو بۆت دەربکەوێ کە خۆر هەیە (٥٠٠) هەزار ئەوەندەی خۆرەکەی ئێمە روناکی زیاترە، ئەو ئەستێرەی خۆمان پێی دەڵێین "گەلاوێژ = الشعری الیمانیة" و دەمەو بەیانی هەڵدێت (٢٦) ئەوەندەی ئەو هەتاوەی خۆمان روناکیی بە هێزترە، ئەمە لە بارەی روناکی خۆرەوە، خۆ لە بارەی گەورەییەوە... زاناکان دەڵێن ئەو تۆزەی لەگەڵ تیشکی هەتاودا دێتە ژورەکەتەوەو لە ناو تیشکەکەدا مەلە دەکات، قەوارەی ئەو تۆزە چەندە لە چاو قەوارەی هەموو زەویدا قەوارەی هەتاویش ئەوەندەیە لە چاو قەبارەی کەشکەشانی "رستە ژنە = سدیم المراة المسلسلة" دا جا بۆ ئەوەی بزانی قەوارەی ئەم سەدیمە چەندە پێت دەڵێم قەوارەکەی هەزار ملیار ملیار ملیار ئەوەندەی هەتاوە، چونکە تیرەی ئەم سەدیمە (٣٠) هەزار ساڵی تیشکییە.




ـ ماشاء الله... ماشاء الله...

ـ ئەی بۆ نالێیت: "ماشاءت الصدفة... ماشاءت الصدفة"؟

وا کاتژمێریش بە چپە پێمان دەڵێت: "هەڵسن و بڕۆن کات درەنگە" و تا سبەینێ بە خوات دەسپێرم.




## لانكۆڵەكەمان

"الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدا" (طه: ٥٣)

ـ كاك كاوە ئەمڕۆ زەوی "ئەو لانكۆڵەی ئێمەی لە سەر دەژین" دەكەین بە بەڵگە بۆ بونی خواو بە درۆخستنەوەی هاوەڵەكانی بەڕێزتان ڕێكەوت پەرستەكان، جا ئێستا با بزانین بۆچی زەوی لە ناو هەموو ئەستێرەكانی تردا بە كەڵكی ژیان دێت؟ بزانین خوا ئەم بارستایی‌و كێشەرو جمەجوڵە تایبەتییەی‌و هەواو ئاو و بە هەزاران جۆرە چەكی تری داوەتێ هەتا ئێمەی كۆرپەلەی ئەم لانكۆڵەیە بپارێزێت؟

قورئان دەفەرموێت "كانتا رتقا ففتقناهما..." زەوی‌و ئاسمان، خۆرو كۆمەڵەكەی یەك پارچە بون، هەروەك زانستی سەدەكانی دوایی سەلماندی كە ئەم فەرمودەی قورئانە راستەو بێ لەكەیە، قورئان‌و زانست دەڵێن كە هەموو كۆمەڵەی خۆر (المجموعة الشمسیة) یەك پارچە بون‌و جیابونەتەوە لە یەكتری، ئایا بۆچی تەنیا زەوی لە ناو هەمویاندا بە كەڵكی ژیانی ئادەمیزاد دێت؟ ئەوانی تر بە كەڵكی ژیان نایەن؟




چونکە:

**١ـ جێگاکەی و سوڕانی:**

جێگای زەوی لە چاو دوورو نزیکی لە خۆرەوە زۆر گرنگە بۆ ژیانی ئێمە، با سەیرێکی سوڕانی هاوەڵەکانی تری زەوی بکەین.

ـ باشە فەرموو.

ـ زاوا "عطارد" ئەویش هەروەك زەوی بە دەوری خۆیداو بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، بەڵام لە ماوەی (٨٨) رۆژی خۆماندا ئەنجا ئەو خولێك دەدات بە دەوری خۆیدا، کەواتە لەم ماوەدا نیوەی سوتێنەرو نیوەکەی تری بەستەڵۆکە.

ــ مژمژە "زهرە" سوڕانی بە دەوری خۆیدا (٢٢٥) رۆژ دەخایەنێ ئەویش وەك زاوا "عگارد" رویەکی زۆر ساردو رویەکی زۆر گەرمە، نە ئاو نە هەوای تێدا نییە، بەڵکو چڕە دوکەڵو هەڵمێکی زۆر پڕی تێدایە، کەواتە بۆ ژیان بە کەڵك نایەت.

ئێستا هەندێك دەڵێن گوایە ئەستێرەی بارام "مریخ" بۆ ژیانی ئادەمیزاد دەست دەدات هەر لەبەرئەوەی کە لە ماوەی



(٢٤) سەعاتدا سوڕانی بە دەوری خۆیدا تەواو دەکات، واتە بەهەمان شێوەی زەوی، بەڵام ڕاستییەکەی بۆ ژیان دەست نادات، چونکە هەر ساڵێکی (٦٨٧) ڕۆژەو پلەی گەرمای (٧٠) پلە لە ژێر سفرەوەیەو گازی ئۆکسجینی تێدا نییە، کەواتە بۆ ژیان دەست نادات.

ئەستێرەی موشتەری کە لە (١٢) ساڵدا شەو و ڕۆژ تەواو دەکات و ئەستێرەی کەش "زحل" کە لە (٢٩) ساڵدا شەوو ڕۆژ تەواو دەکات، خۆ ئەستێرەی "ئۆرانۆس" کە لە ماوەی (٤٨) ساڵداو "نیپتۆن" کە لە ماوەی (١٦٠) ساڵداو "پلۆتۆ" لە ماوەی (٢٤٧) ساڵدا شەوو ڕۆژیان تەواو دەبێت ئاشکرایە ئەمانە هیچیان بۆ ژیانی ئادەمیزاد دەست نادەن... تەنیا زەویە بۆ ژیانی ئێمە دەست دەدات، چونکە نزیکی‌و دوری لە خۆرەوە مامناوەندییەو گەرماو سەرمای مامناوەندییەو بارستایی‌و تۆپەڵەی لە هەمرو کۆمەڵەی خۆر تەنانەت لە خۆریش زیاترەو هێزی ڕاکێشانی مامناوەندییە، سوڕانی ڕۆژانەو ساڵانەی زۆر باشن بۆ دروستکردنی شەوو ڕۆژو کژەکان (وەرزەکان)، ئایا کاك




کاوه ئەم زەوییە ڕێکەوت بە دەستی قودرەتی بەو جۆرەو لەو شوێنەدا دروستی کرد ؟!

**٢ـ هێزی ڕاکێشان "الجاذبیة"**

قورئان دەفەرموێت: **"اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا"** (غافر: ٦٤) ئایا مانای هێزی کێشەر لەم ئایەتەدا بەدی ناکەیت؟ کە ئەگەر ئەم هێزە نەبوایە جگە لەوەی خۆت‌و شارەکەت دەفڕین، هەموو ئەستێرەکان‌و هەتاوەکانیش دەکەوتنە سەر یەك‌و هیچ دیمەنێکی ژیانت نەدەدەدی، بەڵام کاك کاوە هەقی خۆتە باوەڕت بە بونی ئەم هێزە نادیارە نەبێت، چونکە زانیاری ئێستا شوێنەوارەکەی نەبێت هیچی تری لێبەدی ناکات واتە "غەیبە".

**٣ـ چکەکانی تری زەوی:**

کاك کاوە ئەگەر قەوارەی زەوی لەمەی ئێستا گەورەتر یان بچوکتر بوایە ژیان نەدەبوو، خۆ بارستاریی زەوی کەمتر یان






زیاتر بوایە ژیان یان هەر نەدەبوو یان زۆر گران دەبوو، ئەگەر سوڕانی بە دەوری خۆیو خۆردا خاوتر یان کرژتر بوایە، نە بەو جۆرە شەوو رۆژ ڕێكو پێك دەبووو نەکژەکان "فصول" پەیدا دەبوو کە ئەمەیش هۆی پەیدا بونی کشتوکاڵە بۆ تێرکردنی سکمان!

دوریی‌و نزیکیمان لە ناوچەق "مرکز" ی هێزی کێشەری زەوییەوە گەورەترین بەڵگەیە بۆ بەرپەچدانەوەی هەزاران سەرلێشێواوو دەروێشەکانی ڕێکەوت.

ئەی ئاو؟ بەڵێ ئاوی زەوی کە گەورەترین هۆی مانەوەمانە لەم سەر زەوییە، زانیاری دەڵێ ئاو بنەڕەتی ژیانە، کاکە گیان کامەیە جێدەستی ڕێکەوت لە دروستکردنو کاتی بارینیو دابەشکردنی بەم شێوە جوانە، هەروەك دەزانین ئاو لە یەکگرتنی ئۆکسجینو هایدرۆجین پێکهاتوەو ئەم دوو گازەش لە پلەیەکی گەرمی زۆردا نالکێن هەروەك لە سەرمایەکی زۆردا نالکێن، کێ ئەم پلە گەرما مامناوەندییەی بۆ دروست کرد بە تایبەتی لەسەر زەویو بێ دەستە خوشکەکانی تری زەوی؟







ئـيتر باسـی ماسـیو مەلـەوانیو بازرگـانی ئـەم ئـاوەو بڵاوکردنەوەی بەم شێوە جوانـەی کـە (٣/٤)ی روی زەوی ئـاوە، ئەمانە هـەر باسـی مەکـە بـا لـەوە زیـاتر هەسـتی رێکـەوت پەرستەکان بریندار نەبێت.

ئەی هەوا؟ کە یەکێکـە لـە چـەکە بـەهێزەکانی زەوی و بـۆ مانەوەو پارێزگاری ئێمەی رۆڵەی ئەم زەوییە.

کاك کاوە هەمومان دەزانین هەوای ئۆکسـجین بـیٚ تـامو بـیٚ بۆنو بیٚ رەنگەو ناسوتیٚو یارمـەتی سـوتاندن دەدات، هـەموو گیانلەبەران تەنانەت زەوی خۆیشی هەڵیدەمژێت کەچی لە یـەك رێژەی نەگۆڕاودا دەوەستیٚو هـەتا جیهـان جیهانـە زیـادو کـەم ناکات ئەو رێژەیش (٢١٪) ە، خۆ ئەگەر نـەختێك لـەم رێژەیـە کەمتر بێت هەمومان دەمرینو ئەگەر نەختێك لەو رێژەیە زیـاتر بێت ئەوا بە دەنکە شقارتەیەك ناوچـەیەکی گـەورە گڕدەگرێـت، کاکە گیان ببورە لەوەی ماوەم نییە هەتا باسی چۆنێتی مانەوەی ئۆکسجینو هەناسەدانی روەکەکانت بۆ بکەم.

ـ قەیدی نییە فەرمو.



ـ یەکێکی تر لە چەکەکانی زەوی ئاگرە.

ـ ئاگر!؟

ـ بەڵێ ئاگر... زانست دەڵێ ئاگر بریتییە لە رواڵەتی پەرەسەندنی سوتاندنی شت، سوتاندنی (combustion) بە مانای گشتی بریتییە لە رواڵەتی یەکگرتنی تەنێك لەگەڵ تەنێکی ترو ئۆکسجیندا، بەلاّم ئەو سوتاندنەی کە گەرما بگەیەنێت بریتییە لە یەکگرتنی ئۆکسجین لەگەڵ کاربۆندا، ئەم کاربۆنەش لە هەموو تەنێکدا هەیە، بەلاّم رێژەی لە روەکدا زۆرترە لەبەرئەوەی دار باشتر دەسوتێ، ئاگر یەکێکە لە هەرە پێویستیەکانی ئادەمیزاد لەم لانکۆڵەیەدا بۆ خۆگەرمکردنەوەی زستانو چێشت لێنانو پیشەسازیو... هتد، خۆ ئەگەر ئاگریش وەك ئاووهەوا زۆر بوایە هەموو سەر روی زەوی دەسوتان، بەلاّم خوا شاردویەتیەوە لە ناو داری تەڕدا یان لە ژێر زەوی بە شێوەی نەوتو بەنزینو گۆگرد، لە کاتی پێویستدا دەتوانین دروستی بکەین "الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَاراً فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ" (یس: ٨٠) ئاگر هەموو کاتێ ئامادە نییە، بەڵکو







دەبێ ئێمە هەڵسین بە پێکهێنانی، ئیتر کام ڕێکەوتی کوێری بێ دەسەڵات دروستی کرد؟

ئەی ڕوەك "درەخت" کە خوا لە قورئاندا دەیکات بە یەکێك لە بەڵگەکانی بونی خۆیو دەفەرموێت: (وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاء وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ) (الرعد: ٤) واتە: لە زەوییدا چەند پارچە زەوییەك هەنو لە تەنیشتی یەکترن کەچی زۆر جیاوازییان هەیە لەگەڵ یەکتری وەك بەپیتیو بێ پیتی، ڕەقانی... هتد، دیسان باخ و ساباتی ڕەزە ترێو دانەوێڵەو دارخورما یەك پەلو چەند پەل، ئەمانە هەمویان بە یەك ئاو ئاو دەدرێن کەچی ڕێزی هەندێکیانماننداوە بەسەر ئەوانی تر لە خواردندا بە هۆی تامو ڕەنگو بۆنو ئاوداریو وشکییو زۆرو کەمی ڤیتامینەکان... هتد، ئائەمە نیشانەی بونو دەسەڵاتی خوایە، بونی ئەو دەستە بەهێزەی کەبە هەزاران بەڵگەی بەو جۆرە دروستکردوە هەتا بیدۆزینەوەو بیناسین.







به ڕاستی زاناکانیش سەرسامن لەم مەتەڵە... مەتەڵی درەخت. سەیر دەکەیت درەختێك بە تەنیشت ئەوی ترەوەیەو یەك هەوای کاربۆن دەخۆنو بە یەك ئاو ئاو دەدرێن، یەك جۆرە کلۆرۆفیل بەکار دەهێنن، ئەگەر ڕێکەوتەکەی بەڕێزتان ڕاست بێت دەبێ هەموو درەختەکان یەك جۆرە بەر بگرن.

ئەی شێوەی جوانی ئەم لانکۆڵەیە، هەر لە دیمەنێکی جوانەوە هەتا دانیشتنێکی سەرچاوەی زەڵم[٢]، شمشاڵی شوانێکی لاپاڵی چیا، کچێکی نەشمیلە، پارچەیەك سازو ئاواز، شەپۆلی ئاو، پەڕەی گوڵ، باڵی پەپولە، پەڕی عەیانەمەل، کلکی تاوس، بەهارو دەشتی شارەزوور، هاوینو بەفراوی هەورامان[٣] و کۆسالان[٤] و قەندیل[٥] پایزو گەڵاڕێزان، زستانو کڕێوەی بەفر... هتد، ئایا ئەم دیمەنە بە ڕێکەوت دروستبون؟ کاك کاوە بەسە خۆ گێلکردنو پێشێلکردنی ژیری.

[٢] زەلم تاڤگەیەکە لە چیای هەورامان.

[٣، ٤، ٥] "ناوی چەند چیایەکە لە کوردستان" .








ئەمە بوو لانكۆڵەكەمان، یان بڵێین میوانخانەكەمان لـە ڕێـی كاروانی لە دایكبونەوە بۆ گـۆڕ، ئـیتر بـە خـوات دەسـپێرم تـا سبەینێو قۆناغێكی تری باسەكەمان.





## خۆمان

"وَفِي أنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أنَّهُ الْحَقُّ" (فصلت: ٥٣)

كاك كاوه خۆزگه ئەو ئادەمیزادەی بە شەقامەکاندا خۆی بە کەش‌و فشێکەوە با دەدات، دەیزانی لە چی دروستبووە؟

- مەبەستت چییە؟ گوایە ئەویش مرۆڤێك نییە وەك ئێمە؟

- بەڵێ، ئێمەیش، ئێمەو ئەو هەر لەو هێلکەیە دروست بووین.

- هێلکە؟

- بەڵێ هێلکە، هێلکەیەك وەك هێلکەی مریشك، بەڵام زۆر زۆر بچووکتر، بە جۆرێك کە کێشانەی ئەو هێلکەیە بریتییە لە (١)لەسەر ملیۆنی گرامێك ئەم هێلکەیە نێچیری گیاندارێکی نێرینەیە کە پێی دەوترێت "تۆوی پیاو = حیوان منوي" ئەم گیاندارە نێرینەیش زۆر زیرەك‌و وریاو لێزانە... دەزانێت کە هێلکە خۆشەویستەکەی لە دەرگای ماڵەکەیدا چاوەڕێی دەکات‌و دەشزانێت هیچ رێگایەك نییە بۆ گەیشتن بەو خۆشەویستە لە رێگای منداڵدان "رحم" ە وەنەبێت، لە کاتی کۆبونەوەی پیاوو



ژندا "جماع" نەبێت، جا پێش ئەوەی بگاتە لای خۆشەویستەکەی دەزانێت ئەم زۆر بچوکە لە چاو هێلکەکەداو ناتوانێت دیواری هێلکەکە بدڕێتو بچێتە ناویەوە بۆیە داوا لە ڕێکەوت ددکات کە سەرێکی تیژی بۆ دروست بکات، هەتا بتوانێت دیواری هێلکەکە بدڕێتو بچێتە ژوورەوە، دیسان ئەم گیاندارە لە ناو ئاودایە چۆن بڕوا؟

- چۆن؟

کاك کاوە – ڕێکەوت – ملێکی درێژو کلکێکی درێژو سەرێکی تیژی بۆ دەردەکات هەتا بتوانێ مەلە بکاتو ئاوەکەی بە تیژی ببڕێتو هەر بە تیژی خۆی بدات بە دیواری هێلکەکەداو بچێتە باوەشی خۆشەویستەکەیەوە.

ئەم هێلکە مێیینە داوێن پاکە بە وەفایەش زۆر بلیمەتە، دەزانێ ئەم تاقە هێلکەیەو ئەوانیش بە هەزاران گیانلەبەری نێرینەن کە هێرشیی بۆ دێنن. ئەی چۆن بتوانێ خۆی لێیان ڕزگار بکاتو بێمێردیش نەمێنێتەوە؟ ئەم هێلکەیە بڕیار دەدا هەر کام لەم گیانلەبەرانە یەکەم جار گەیشتە لای، قۆڵ بکات بە



قۆڵیداو بە مێردی وەربگرێتو دەرگا لە سەر هەموو ئەوانی تر دابخاتو ئەوانیش هەموو لە خەفەتاندا با هەمویان بمرن.

ئابەم جۆرە یەکەم قۆناغی دروستبونی ئەو ئادەمیزادە بە فیزە لە ناو منداڵدانی دایکیدا دەست پێدەکات، بە داخەوەم کە ناتوانم قۆناغەکانی تریت بۆ باس بکەم، چونکە کاتێکی زۆرمان پێویستە، ئایا کاك کاوە کامەیە جێدەستی رێکەوت لە چۆنێتیی دروستبونی ئەم ئادەمیزادەو بەم شێوە وردە؟!

ـ من بەم جۆرە زانیارییانەم نەزانیوە، ئەی ئێوەی "فەقێ" و ماڵانگەڕ جگە لە "ضرب زید" بەولاوە هیچی تریان نەخوێندوە ئەمانەت لە کوێ هێنا؟ مەلاو لێکۆڵینەوەی زانستی؟

ئەوە کەی وردبین "میکرۆسکۆب" تان بردە "حوجرە"وەو شیتەڵی ئەم زانیارییانەتان کرد؟

ـ کاك کاوە مەترسیدارترین شت لەسەر سنگی گەلەکەمان ئەوەیە، لە وڵاتی ئێمە ئەوەی ئاینیی ویست ئیتر زانیاری تازەی ناوێتو ئەوەیش زانیاری نوێی ویست ئیتر ئاینی ناوێت، بۆیە ئەوەی زانای ئایینیە هیچ لە زانیاری نوێ نازانێتو ئەوەیش کە







زانای نوێیە هیچ لە ئایین نازانێت، ئەمانە هیچیان لە مانای ڕاستی ئایینو زانیاری نازانن... هەر دوو لایان بە هەڵە چوون... نەخۆشن... دورن لە ئیسلامو زانیاری ڕاستەقینەوە...نەزانیمان کرد کە میکرۆسکۆپمان نەبردە "حوجرە" وە[4]. کاك کاوە ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەباتو لە باسەکەی خۆمان دەرمان دەکات.

ـ باشە فەرموو بۆ سەر باسەکەی خۆمانو باسی خۆمان.

ـ باسی چیی خۆمانت بۆ بکەم؟ هەر پارچەیەك لە لاشەت بگریت پێت دەڵێت کە کێ دروستی کردووەو پەنجە بۆ پەروەردگارەکەی درێژ دەکات، تەنیا مەرج ئەوەیە بە زمانی ژیریی‌و دڵی ژیریی‌و چاوی ژیریی لە پارچەکانی لەشمان وردببینەوە.

ئەم مرۆڤە سەرسوڕهێنەرە ژیانی وەك هەموو زیندەوەرە بێ زمانەکانی تر لە گڵو ئاوە، کەچیی لە دواییدا دەبێت بە فەیلەسوفو بیر لە بونەوەر و خۆی و خوا دەکاتەوە، ئیتر باسی چیی ئەم مرۆڤەت بۆ بکەم؟ چۆن لە پشتی باوکیدا پەیدا

[4] لەم باسەدا نامیلکەیەکم نوسیوە لە ژێر ناونیشانی "ئیسلام ، ڕۆڵەکانی نەزانو مامۆستاکانی نەمەڵن" پشت بە خوا لە چاپ دەدرێت.







دەبێتو چۆن کۆچ دەکات بۆ سکی دایکیو لە وێوە بۆ جیهانو ژیانو روناکیو شیر مژین؟ چۆن هەناسە دەدات، خواردن دەخوات، جوین، قوتدان، چۆن گۆشتی پێ دروست دەکات؟ چۆن گەرما دەگەیەنێت بە لاشەیو چۆن ناو سکی گسك دەدات بۆ دەرەوەو چۆن دیسان پڕی دەکاتەوە؟

چۆن شەقە جۆگەی خوێن وەك جۆگەی دەلێنو چەقان[٥] بۆ هەموو تێشوەکانی لەشی راکێشاوەو لەم سەرەوە خوێنێکی سووری گەشی پاك لەگەڵ خۆیدا دەباتو لەو سەرەوە خوێنێکی شینی پیس لەگەڵ دەیان لاشەی کرێکاری کوژراو دەهێنێتەوە؟ چۆن لاشەی ئەم مرۆڤە لە ملیۆن، ملیۆن سێڵ "خلیة" پێکهاتووەو چۆن ئیش دەکەن؟ چۆن ئەم لاشەیان پێکهێناوە؟ ئەم لاشەیەی کە بریتییە لە جەنگێکی جیهانی، بە هەزاران خڕۆکە دەدات بە کوشتو دیسان پاڵ دەنێت بە لەشکرێکی ترەوە بۆ پڕکردنەوەی سەنگەرەکان... هەموو کەلاوەیەك ئاوەدان دەکاتەوەو هەموو خوێن بەربونێك دەبەستێتەوە!

---

[٥] دەلێن و چەقان ناوی دوو جۆگەی بەریلاون لە شارەزوور.







ئەی ژیریی "عقل" کە ژیریی خۆی سەرگەردانە لـە چـۆنێتی خۆی، ئەی بە هەزاران شێوەو رەنگـو چاکەو بـەد، بـە هـەزاران بەسەرهاتی تۆمارکراو... لە کوێن؟ چۆن وا دێن بە دەستەوە لـە کاتی داوا کراودا؟

کاك کاوە – نەك چـۆنێتی کارکردنیـان تەنانـەت – نـاتوانم ناوەکانیشت بۆ هەڵبدەم... جا ئەم سەنگـو تـرازووە لـە کـوێو کێشـانەی رێکـەوت لـە کـوێ! تـۆ بـاوەڕت بـەوە نییـە کـە بومەلەرزەیەك لە چاپخانەیەکدا ببێتە هۆی چاپ بونی دیوانێکی شیعر، بەڵام بڕوات بەوە هەیە ئەم هەموو وردەکارییە لە خۆیەوە بەرێکەوت بوو بێت؟! "أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً" (الكهـف: ٣٧) ئایا ددان نانێیت بە بونی ئەوەی دروستی کردویت لەگڵو کردویتی بە پیاو کاك کاوە!

"فَوَيْلٌ لِّلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكْرِ اللَّهِ" (الزمـر: ٢٢) هـاوارو هەش بەسـەر ئەوانـەی دڵـڕەقن لـە یـادی خـودا، کـاك کـاوە!

واکاتیشمان تەواو بوو تا سبەینێ خوات لەگەڵ.




## سەردانێك لە ژێریی

"... أفلا تعقلون؟"

کاك کـاوە مـاوەیـەك لەمــەوپێش لـە گۆڤـارێکی میســرییدا خوێندمەوە کە لە کاتێکدا تیپێکی سێرك یارییەکی دەکـرد لـە پێش چاوی سەیرکەرەکانی، لەم یارییەدا شـێرێك هێنرایـە سـەر شانۆ بۆ یاری، پاش ئەوەی یاری پێکەرەکەی کـە نـاوی "محمـد الحلو" بوو یارییەکەی بە شـێرەکە تـەواوکرد، چـەپڵەیەکی زۆرو هەڵنانیان بـۆ "محمـد" لێـدا، ئـەمیش ئـاوڕی دایـەوە بـە لای سـەیرکەرانەوەو پشـتی کـردە شـێرەکە بـۆ ئـەوەی سوپاسـی چەپڵەلێدەرەکانو سەیرکەران بکات، لەم کاتەدا شێرەکە هێرشی هێنایە سەریو بە چنگو قەپ تێی بەربوو، موحەممەد خـەڵتانی خوێن بوو، سەیرکەرەکان بە هاوارو پەلاماری کورسی هێرشـیان هێنایە سەر شێرەکەو بەهەر جۆرێك بوو موحەممـەدیان لـە ژێـر چنگی دەرهێناو بە پەلە گەیاندیانە نەخۆشخانە، بەڵام بێ سـود بوو، لە پاش تەواو بونی دوا وشەی کە وتـی "تکـام وایـە ئـەم شێرە نەکوژن، توخوا مـەیکوژن" موحەممـەد گیـانی دەرچـوو و



مرد، بەڕێوەبەری سێرك بڕیاریدا بە ناردنی شێرەکە بۆ باخچەی گیانلەبەران "حديقة الحيوانات" لەبەر ئەوەی شێرێکی دڕندەیەو بۆ یاری پێکردن ناشێت.

بەڵام ئایا دەزانی شێرەکە چیکرد؟

ـ چیکرد؟

ـ کاك کاوە ئەم شێرە مانی گرت لە خواردن، چەندە خەریکی دەبون خواردنی نەدەخوارد، مێیینەیەکیان بۆ هێنا، بەڵکو لەگەڵیدا رابێت، بەڵام بێ سود بوو، هەر کە لێی نزیك دەبویەوە لێی دەداو بە نینۆك تێی بەردەبوو، ئەم شێرە وەك شێتی لێهاتو بەربووە گیانی خۆیو بە چرنوك لاشەی خۆی ئەنجن ئەنجن کرد، ئەوەندەی گاز گرت لە کلکی هەتا قرتاندی، ئەمجارە بەربوە دەستو قۆڵی ئەو دەستەی موحەممەدی پێ کوشتبوو بەربووە خواردنی گۆشتی خۆی لە داخاندا، بەڵێ بەربووە خۆی هەتا خوێنی بەربوو نەگیرسایەوەو مرد، لە داخی پەشیمانی مرد، لە پاش بیرکردنەوە لە تاوانەکەیو هەستکردنی بە تاوان... بەڵێ پاشایەك لە پاشاکانی بێشەو بە خوێن مژ







بەناوبانگ هەستی بە پەشیمانی کرد، بەڵام کاک کاوە ئێمەی مرۆڤ زۆر لەوان دڕندەترین هەرگیزیش هەست بە پەشیمانی ناکەین... لە سەر مێزی "دیبلۆماسی"و بە دەم پێك هەڵدانەوەو بە سادەییەکەوە بڕیاری کوشتنی ملیۆنەها کەسی بێتاوان دەدەین‌و خۆشمان لە گەشتی خۆمان ناکەوین هەروەك هیچ نەبوو بێت.

کاک کاوە ئایا شێرەکە لە وتەکەی "موحەممەد" تێگەیشت کە وتی:

داواکارم ئەم شێرە مەکوژن.

ـ نازانم.

ـ کەواتە ئێمە هیچ لە چۆنێتی هەستی زیندەوەرانی بێ زمان نازانین.

ئەی پشیلە کە پیسایی خۆی دەشارێتەوە، مانای جوانی‌و ناشیرینی‌و عەیبە دەزانێ؟

هەنگ، ئەگەر زەردەواڵەیەك بڕواتە شانەکانیانەوە دەکەونە جەنگ لەگەڵیدا هەتا دوا هەنگ خۆیان بەخت دەکەن لە ڕێی







نیشـــتیمانەکەیاندا، ئایـــا کـــێ فێـــری پێشـــمەرگەیی‌و نیشتیمانپەروەری کردن؟ یان هەر کـە پاشـاکەیان دەمرێـت لـە ناوخۆیانــدا پاشــایەك هەڵدەبــژێرن، کــێ فێــری هەڵبــژاردن (کۆنفراس)ی کردن؟

یان زەردەواڵە کە مێروو بەنج دەکـات‌و چـزووی دەچـەقێنێتە شوێنی دەماری (عصـبی) ئـەو مێـرووە بـێ هەسـت "بـەنج" دەبێت‌و دەیبات لە ژێر هێلکەکەیـدا دایـدەنێت، جـا هـەر کـە بەچـکەکەی هـەڵێنا خـواردنێکی تـازەی نایـابی دانـاوە هـەتا بەچـکەکەی بیخـوات، کاکـە گیـان ئـەم زەردەواڵەیـە لـە کـام زانستگای پزیشکی دەرچووە؟ وا بەو جـۆرە شـوێنی "دەمـار = عصبی" ئەو مێروە دەزانێت.

یان ئەو مێروو کرمانەی کە لـە رەنگـی ئـەو شـوێنەی تێـدا دەژین بەرگ بۆ خۆیان دەکەن، لـە کـوێ یاسـای چەواشـەکردن‌و خۆحەشاردان "الغش والاختفاء" فێربون.

وشتر، هەتا یـەکێك دیاربێـت ناچـێتە لای مێینەکـەی، خـۆ ئەگەر لەو کاتەدا یەکێك چوو بە سـەریاندا سـەریان دادەخـەن‌و







تەریق دەبنەوە، ئایا ئەم وشترە مانای شەرم دەزانێ؟ ئایا ئەم وشترە بەناموستر نییە لە زۆربەی لاوەکانی پاریس‌و نەرویج؟

ئەی کاك کاوە چۆن مێرولە کار دابەش دەکات بە سەر ئەندامەکانی شارەکەیدا کە بە هەزاران مێرولە دەبن؟ چۆن دەتوانن هەڵسن بەو یاسا رێك‌و جوانە کۆمەڵایەتییە وردە، بێ ئەوەی زمانێك هەبێ پێی بدوێن؟ ئایا ئەمانە لەگەڵ کام بارسەنگی رێکەوتدا هاوکێش دەردەچن؟

ـ دەڵێین ئەمانە یاسای سروشتە.

ـ کاك کاوە، سروشت چییە؟ دەبینرێت؟

ـ نا.

ـ ئەی سروشت چییە؟!

ئەمە راکردن‌و هەڵاتنە لە وشەی "خوا" وە بۆ وشەی "سروشت"، سروشت هەر بەمانای خوایە‌و هیچ جیاوازیی نییە، سروشتی خاوەن دەسەڵات‌و زانا‌و توانا‌و ئاگادار لە هەموو چپەیەکی ناوخۆیی هەر لە بنی زەوی هەتا دورترین کەشکەشانی گەردون، بەڵێ ئێمە ئەو سروشتە دەپەرستین، تەنیا ئەوەندەیە،



ئێوەی سەرلێشێواوە پێی دەڵێن "سروشت"و ئێمەی خاوەن باوەڕ پێی دەڵێن "خوا"، ئەمە قینەبەرایەتی‌و خۆبەزلزانینە... ئەمە راکردنە لە وشەیەکەوە بۆ وشەیەکی تر، من زۆر لێم رونە خۆیان "ئەو زلانە" هەست دەکەن بە بونی ئەو خوایەو هەرچەندە دوور بڕۆن لە ئەنجامدا سەریان دەدات لە بەردو لەو سەرەوە دەگەڕێنەوە، بەڵام بیر ناکەنەوە لەوەی بزانن ئەو بەردە چنی بوو دای لە سەریان؟ ئاخ... ئەوانە چەندە ئاتاجی ماوەیەك تەنیاییو بیرکردنەوەن، ئەو کاتە دەزانن "سروشت" راکردنە لە وشە بۆ وشە بێ زیادو کەم.

دیسان هەر زانست دەڵێت: "هەموو زیندەوەرێك بەشی خۆی هەستی هەیە، ئەوەندە هەست بە شت دەکات بەشی هەڵسوڕاندنی ژیانی خۆی"، بەڵام ئایا کاك کاوە هیچ زیندەوەرێك راستی چۆنێتی ئێمەی مرۆڤ دەزانێ؟ ئایا دەزانێ لەشی ئەم مرۆڤە چۆن پێك هاتووە، چۆن دەبیسێو چۆن دەخوات، سوڕانی خوێنی ئەم مرۆڤە چۆنە؟ یان چۆن ئەم ئادەمیزادە بیر لە شت دەکاتەوەو شت دادەهێنێو دەزانێ ئەم








مرۆڤه چەند شتی سەرسوڕهێنەی داهێناوەو بۆچی دایهێناوە؟ هتد...، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی زیندەوەران لەگەڵ هەستی ئێمەدا زۆر نزیکترە لە چاو هەستی ئێمەدا بەرامبەر هەستو دەسەڵاتو چۆنێتی خوادا.

ئا بەم جۆرە ژیریی پەنجە رادەکێشێت بۆ خوا، پیشانت دەدا کە کێ پەروەردگاری ئەم بونەوەرەیە.

ئیتر تا سبەینێ بە خوات دەسپێرم.



## هاوبەشی لە کۆڕێکی زانیارییدا

" إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء" (فاطر: ٢٨)

ـ کاك کاوە ئەمەی لە پێشەوە باسمانکرد، هەمووی تێبینیو سەرنجو زانیاری بوو لە بارەی خواو شیتەڵکردنی وشەی رێکەوتەکەی بەرێزتانەوەو کێشانەی بە ترازوی ژیری، بەڵام با سەرێکیش لە کۆڕی مەستانی جامی زانیاری و زانست بدەینو بزانین لەوێ دەنگو باس چییە؟ بزانین ئەوان تێڕوانینیان بەرامبەر بە وشەی "خوا" چۆنە؟

ئەنەکساگۆرس[٦] دەڵێت:

هەرگیز نابێت هێزێکی کوێرانە "قوة عمياء" ئەم بونەوەرەی دروستکردبێ، چونکە هێزی کوێری — بێ دەسەڵاتی خوایەتی — و پشێوی زیاتر هیچی تری لە دەست نایەت، ئەم بونەوەرەش دورە لە هەموو پشێوییەك، ئەوەی کە ماددە هەڵیدەسوورێنێ ژیرییەکی بە دەسەڵاتو بینەرو زانایە.

ئەفلاتون[٧]:

---

[٦، ٧، ٨، ٩] لە فەیلەسوفە بەرزەکانی یۆنانیو لە بیرتیژەکانی مرۆڤایەتی دەژمێردرێن.








بونەوەر نمونەی جوانیی‌و یاسایە هەرگیز نابێت بێنیازێک "قصد" و لە خۆیەوە بوو بێت.

ئەرستۆ[٨]:

ئێمە زۆر کەمترین لەوەی کە خوا بیرمان لێبکاتەوە، چونکە ئێمە لە ریزی "هیچ" داین.

ئەکویناس[٩]:

ژیری ئێمە پەستە لە زانینی راستی هەموو شتێك، راستیی هیچ شتێك ماددە نەبێت نایزانێ... بەڵکو زۆر رواڵەتی ژیان بۆ ئێمە رون نەبووەتەوە، هیچ زانایەك نەبووە تا ئێستا راستیی چۆنێتی مێشێکی زانیبێت.

دیکارت[٧]:

بونی من شتێکی راستەو من هەم... ئەی کێ دروستی کردوم؟ خۆ خۆیشم خۆمم دروست نەکردوە، کەواتە دەبێ پەروەردگارێکم هەبێت‌و پەروەردگارەکەشم بونی پێویست "واجب

[٧] "دیکارت" فەیلوسوفێکی بەرزی فەرەنسییە.








الوجود" بێتو دەبێ خاوەنی هەموو ئاوەڵناو "صفە"ێکی تەواو بێت ئەویش خوایە.

رۆجەر باکۆن[٨]:

هیچ زانایەك نییە لە هەموو زاناکانی سروشتگەری بتوانێ هەموو شتێك لە ژیانی تاقە مێشێك بزانێ، چ جای ئەوەی بیەوێت لە چۆنیەتی بونو ژیانی خوا بزانێت.

باسکال[٩]:

دوو دەستە هەن لە ئادەمیزاد کە بە راستی پێیان بوترێت ژیر:-

یەکەمیان: ئەوانەن کارگوزاری خوا دەکەن، چونکە ناسیویانە.

دووهەم: ئەوانەن کە تێدەکۆشن بۆ ئەوەی خوا بدۆزنەوە، چونکە نەیانناسیوە.

ئەنشتاین[١٠]:

---

[٨] باکۆن : مامۆستایەکی بەرزی زانکۆی "ئۆکسفۆرد"ی ئینگلیزی بوو.

[٩] پاسکال : زانای هەرە بەرزی فەرەنسییە، خاوەنی زۆر بیردۆزی ماتماتیکو فیزیکو ئەندازیارییە.

[١٠] ئەنشتاین: زانای هەرە بەرزی ئەڵمانییەو خاوەنی بیردۆزی "نسبی"یە، لە ساڵی ١٩٥٥ دا کۆچی دوایی کردووە.




ئاینیی بێ زانیاری کوێرەو زانیاری بێ ئایین شەل.

کانت[11]:

من پڕ بەدڵ بڕوام بە بونی خواو هەتا هەتاییو نەمردنی گیانو راستی رۆژی پاداشت "یوم الجزاء" هەیە، بەڵام ژیریی توانای زانینی چۆنێتی ئەم رێگایەی نییە.

جێمس جێز[12]: کاتێ بە گەورەترین تەلەسکۆب سەیری دورترین کەشکەشانی گەردون بکەین، دەبینین ئەویش هەر بەم یاسایەی کەلای زەوی ئێمە هەیە هەڵدەسوڕێت ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم بونەوەرە یەك پرۆژەیەو یەك خاوەنی هەیەو بێخاوەن نییە.

داروین[13]:

---

[11] عەمانوئێل کانت: فەیلەسوفێکی هەرە بەرزی ئەڵمانییەو خاوەنی باوەڕێکی پتەو بووە.

[12] جێمس جێز: زانای هەرە بەرزو بەناوبانگو گەردونناسیی بلیمەت بوو، خاوەنی ئلد بیردۆزی گەردونناسییە.

[13] داروین: زانای سروشتگەرییەو خاوەنی تیۆری "النشوء والارتقاء"ە.

 

بیردۆزی پەیدابونو گەشەکردن (النشوء والارتقاء) مانای نەبونی خوا نییە، چونکە ژیریی قایل نابێت بەوەی ژیان یەکسەر لە ماددەوە پەیدا بوو بێت.

کاتێ پرسیاریان لە "ئەدیسۆن"[١٤] کردو وتیان: ئایا تۆ بۆچوونت چۆنە بەرامبەر بە بونی خوا؟

وتی: بێگومان من بڕوام بە بونی خوا هەیە.

وتیان، ئەی بۆچی نابینرێت؟

وتی: من کارەبام دروستکردوەو زۆر بە باشی ئەو دەناسم، بەڵام ئایا کارەباکە من دەناسێتو هەست بە بونی من دەکات؟

وتیان: نا.

وتی: هەموو دروستکراوێك لە چاو دروستکەرەکەیدا هەروایە.

کاك کاوە وتەی زاناکان لەم بارەوە دوایی نایەت، هیچ زانایەك نەبووە باوەڕی بە بونی خوا نەبوبێت، بەڵام هەندێك لە زاناکان لەبەرئەوەی چۆنێتی رێگای بۆچونی (خوا)یان نەزانیوەو

---

[١٤] ئەدیسۆن: زانای فیزیکی ئەمریکییو داهێنەری کارەباو کامێراو قەوان بوو.







ویستویانە (خوا) وەك قەوارەیەكی ماددی بەردەستیان بكەوێت، ڕێگایان لێ تێكچوەو توشی هەزاران گومان سەختی هەزار بە هەزار بون.

هەندێك لە زاناكان تەنیا بە باوەڕ وازیان نەهێناوە، بەڵكو نوێژیان كردوەو باوەڕیان بە بونی فریشتەكان هەبووە وەكو "ئەلەكسیس كاریل"[١٥] كە دەڵێت: زۆر زیندەوەری زانا هەن‌و چواردەوری ئێمەیان گرتووە، بەڵام ئێمە ناتوانین بە "میكرۆسكۆب" بیانبینین، بەڵكو بە نوێژو نزیكبونەوە لە خوا دەتوانین بیانبینین‌و ببینە شیاوی بەزەیی ئەو ژیرییە شاراوانە.

یان ئەوەی بڕواتە "لەندەن – لە گۆڕەپانی /٣٣ مارلبورن" كە كۆمەڵێكی گیانی "الجمعیة الروحیة" ی تێدا هەیە، لە پێنجەمین نهۆمی ئەو كۆمەڵەدا شوێنێكی تایبەتی هەیەو كاتی خۆی "ئۆلیڤەر لۆدج"[١٦] نوێژی تێدا كردووە.

---

[١٥] كاریل: پزیشك‌و زانای هەرە بەرزی فەرەنسییە، لە ساڵی ١٩١٢دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرت‌و خاوەنی كتێبی "الانسان ذلك المجهول"ە.

[١٦] لۆدج: زانای بەرزی ئینگلیزو دروستكەری سەمماعەی رادیۆیە.



کـاك کـاوە ئەمانـە هیچـیان کرێگرتـە نـەبونو فەقێیـەتی خانەقای "بیارە"یشیان نەکردوەو "ضَرَبَ زَیـد" یان نەخوێندوە، بەڵکو پیاوانی زانیاری بون کەچی باوەڕیشیان بە بـونی خـوا تـا ئەو رادەیە بەهێزە بوە، بەڵام زۆر راستە کە ئێمە نەزانین، گێلین، نەفامین، دواکەوتوین، چونکە زۆر زوو چاوبەسـتمان لێـدەکرێتو بە هەموو لایەکدا سەمامان پێدەکرێت.

ـ وتەکانت لە سەر سەرم، بە راستی زۆر کەلەبەری رێگات بۆ روناك کردمەوە، بەڵام کەی ئێمەی تازە پێگەیشـتوو بـەم جـۆرە بیر لە شت دەکەینەوە؟ کەی ئەوەی پێـی دەوتـرێ "پـەروەردەی ئاینیی" و ئێمە لە خوێندنگەدا دەیخوێنینو بەرگەی ئەو هـەموو هێرشە دەگرێت کە گومان بۆمـانی دەهێنـێ؟ بـڕوام هەیـە بـە خوا... خاوەنی بونەوەر، بڕوام هێنا بە چاوڕاوی خۆمان، بـڕوام هێنا بە راکردنمان لە وشەی (خوا) وە بۆ وشەی (سروشت)، بڕوام هێنا بە کوێریو بێ دەسەڵاتی ماددەو ناڕاستی بیرکردنـەوەی رێکەوتو سەرلێشێواوی ئێمە، بە ڕاستی ماوەیەك مـن هەسـت بە باڵەپەستۆیەکی دەرونی دەکـەم، هەسـت بـە جیهـانێکی تـر



دەکەم بێجگە لەم جیهانە ماددییـە، هەسـت بـە بـاوەڕو تـامو مەزەی باوەڕ دەکەم، ئێمە وا بۆ شـەش مـانگ دەڕوات کـەسو کاری خۆمانمان نەدیوە، کەچـی مـن مـەزەی بـاوەڕ بـە جـۆرێ مەستی کردوم هەست بە هیچ شتێکی تر ناکەم خۆزگـە هـەموو کەس بیزانیایە لـەزەتی بـاوەڕ چـەند خۆشـە، خۆزگـە تاقییـان دەکردەوە.

ـ سوپاس بۆ خوا، کە بە یەکجاری رێگات لێ ون نەبوو، خوا یارمەتیدایت بۆ دۆزینەوەی ڕاستی، منیش پشومدا، چونکە بۆم دەرکەوت نەمامەکەم لە ماوەیەکی کەمدا هاتە بـەرو ڕەنجەکـەم بە فیڕۆ نەڕۆیشت.

ـ بەڵام توخوا تۆ ئەم کۆڕەمـان لـێ تێـك مـەدەو هـەتا بـە تەواوی لەم نەخۆشیو بێ هۆشییە رزگـار دەبم بـەردەوام بـە لـە ئامۆژگاری کردنم.

ـ بە پشتیوانی خوا لە سەری دەڕۆین، بەڵام وا ئێستا کاتمـان تەواو بوو، تا سبەینێ بە خوات دەسپێرم.




## لێك پچڕان

بەڵێ هەر وەك كاك كاوە دەڵێ ماوەی شەش مانگمان تەواو كرد لە ژێر سایەی سەربازیی "عارفی"[17]، بەڵام تامی وچان "اجازە"مان نەكرد، بەم هۆیەوە زۆر لە سەربازە كوردەكان ڕایان كرد، بە جۆرێك بەرپرسیاران هەستیان پێ كرد... ئەو ڕۆژە ئێمە "كوردەكان" یان كۆكردەوەو وتیان هۆی ڕاكردنی ئەم هەموو سەربازە چییە؟ شەوی وا هەیە سەد سەرباز پێوار "غائب" دەبێت؟ كوڕێكی قەرەداغیی كە ناوی "فەریق" بوو لە ڕیزەكە دەرچوو وتی: ڕاستییەكەی بێوچانیی"اجازە"یە، وچانمان نادەنێ هۆی ئەوەیە... بەڵێ بڕیاردرا هەر ئەو ڕۆژە پۆستەیەك بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان، لەوانە كاك كاوەی خاوەن باوەڕ بوو... ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە بۆ ماوەی (٧) ڕۆژ، بەڵام پاش ڕۆیشتنی ئەو بۆ ماڵەوە بۆ (٥) ڕۆژ منیش ڕۆشتم بۆ "خولی فێربونی بێتەل (لاسلكی)" بۆ هەولێرو ئیتر كاك كاوەم نەبینیەوە...

---

[17] عارفیی بەكاردەهێنرێت بۆ ماوەی ڕژێمی "عەبدوسەلام و عەبدوڕەحمان موحەممەد عارف"ی برای لە عێراقدا.



پاش جێگیربونم لە هەولێر، ئەم نامەی خوارەوەم بۆ کاک کاوە نوسی.

**نامەکە:**

هاوەڵی خۆشەویست کاک کاوە گیان

سڵاوی خوات لێ بێت

هیوادارم ئەو تروسکاییەی کەوتووەتە دڵتەوە نەهێڵیت بکوژێتەوە، بەڵکو بیکەی بە گڕێك‌و هەموو باوەڕێکی پووچ‌و بەدی پێ بسوتێنی.

چاوەکەم: کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە، بەڵکو لە خوێندنەوەی کتێبی چاك‌و کردەوەی چاکدا بەکاری بهێنە، وا بزانە ئەم تەمەنەی پێت دراوە وام‌و پێشینە "قرض و سلفة"یە... بیرەوەریی ڕێکەوت بۆ ئادەمیزاد دەست نادات، بەڵکو بۆ ئەوانە دەست دەدات خۆیان بە بەچکەی مەیمون‌و چەقەڵ دەزانن، ئەوەش خۆی بە نەتەوەی مەیمون‌و چەقەڵ دەزانێت‌و بونی "ئادەم"ی بە لاوە ئەفسانەیە لۆمەی ناکرێت.







کاکـه گیـان: پیرۆزبـایی دۆزینـەوەی ڕاسـتیت لێ دەکـەمو هیوادارم لە سـەری بڕۆیـتو چـاڵو چـۆڵی گومـان لـەرەت پـێ نەکاتو خۆت ڕابگریت لەبەر گێژەلۆکەی تانەو تەشەری سەر لێ شێواوەکاندا دەزانم ئێستا پێت دەڵێن:

کاك کاوە ئەوسا بۆچی وات دەوتو ئێستا بۆچی وا دەڵێیـت، دەزانم هەوڵ دەدەن بۆ گەڕانەوەت بۆ سەر لێ شێواویی، بەڵام تۆ ژیریی خۆت بخەرە کارو بزانە ئێستا دڵنیایـت یـان ئـەو کاتـە؟ بزانە ئێستا دەرونـت پـڕ ئارامـە یـان پێشـتر؟ شـوێن کـەوتنی ڕاستییت مەبەست بێتو هیچی تر، کاتێ کتێبی "گەشتەکەم لە گومانـەوە بـۆ بـاوەڕ" کـرد بـە کـوردیی دەرگـای نامەنوسـیم لێکرایـەوە لەگـەڵ"دکتـۆر موسـتەفا مـەحمود" بـە هـۆی "دارالشروق"ەوە لە "قاهیرە" نامەم بۆ دەنوسی، لە نامەیەکەدا بۆم نوسی" تۆ لە کتێبی ـ ابلیس ـ دا وا دەڵێیـتو کەچـی لـە کتێبی (القرآن محاولة لفهم عصري) دا شـتێکی تـر دەڵێیـت... کەس لە تۆ تێناگات، تاوێك باوەڕت تـەنیا بـە مـاددە هەیـەو تاوێك بە (خوا)... هتد".








له وه‌ڵامدا نوسییه‌وه‌و وتبوی:

"تۆ یه‌كه‌م كه‌س نیت ئه‌م ره‌خنانه‌م لێ ده‌گریت، به‌ڵكو به‌ هه‌زاران كه‌س هێرشم بۆ ده‌هێننو لۆمه‌م ده‌كه‌ن كه‌ بڕوام به‌ (خوا) هێناوه‌و سه‌ر لێ شێواوی خۆمم بۆ ده‌ركه‌وتووه‌، به‌ڵام ئێوه‌ من به‌چی ده‌زانن؟ به‌ پارچه‌یه‌ك ئاسن، یان دارێكی ڕه‌ق، یان ئاوێكی زه‌لكاو؟ نه‌خێر، من مرۆڤم، ئاده‌مم، خوا ژیریی داومه‌تێ هه‌تا هه‌ڵه‌ی پێ ڕاست بكه‌مه‌وه‌، خۆ ئه‌گه‌ر موسڵمان بومایه‌و پشتم له‌ ئاینه‌كه‌م بكردایه‌و دوای سه‌ر لێشێواوه‌كان بكه‌وتمایه‌، كه‌س به‌ لایه‌وه‌ سه‌یر نه‌بوو، به‌ڵكو له‌وانه‌ بوو لاپه‌ڕه‌كانی ڕۆژنامه‌و گۆڤاره‌كان به‌ ناوی من پڕ بكرایه‌ته‌وه‌، شووره‌یی نییه‌ مرۆڤ هه‌ڵه‌ی خۆی ڕاست بكاته‌وه‌و په‌نجه‌ بۆ خاڵه‌كانی هه‌ڵه‌كه‌ی رابكێشێت، من یه‌كه‌م كه‌س نه‌بوم هه‌ست به‌ هه‌ڵه‌ی خۆم بكه‌م، "خالیدی كوڕی وه‌لید" زۆر به‌ پاڵه‌وانیی دژی موسڵمانانو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان جه‌نگاو ته‌نانه‌ت له‌ جه‌نگی "ئوحود" دا له‌ شكری موسڵمانه‌كانی شكاند، كه‌چی په‌شیمان بویه‌وه‌و ئاڵای ئیسلامی گرت به‌ ده‌سته‌وه‌و بوو به‌ سه‌ر له‌شكری



موسڵمانەکانو ناونرا "شمشێری خوا = سیف الله"، "عومەری کوڕی خەتاب" موسڵمانەکان لە ترسی نەیاندەوێرا ببزوێن، کەچی لە دواییدا باوەڕی هێناو بوو بە پاڵپشتێکی گەورە بۆ ئیسلام".

"دکتۆر مستەفا" لە سەر نامەکەی دەڕواتو دەڵێت:

"مرۆڤ لە سەردەمی لاوییدا حەز بەوە دەکات باوەڕ بە شتێك بهێنێ کە لە بەر چاوی بێتو بە چاوی خۆی ئەو شتە ببینێ، لە بەر ئەوەی باوەڕی ماددییەت زۆر بە ئاسانی دەچێتە مێشکی لاوێکی تازە پێگەیشتوی خوێن گەرمەوە، هەتا پیرێکی دنیادیدەی خاوەن تاقیکردنەوەی جۆر بە جۆر، منیش هەر بەجۆرە هۆشم پەیداکردو ژیریی و زانست رێگای راستیان نیشاندام، خەڵکیش چی دەڵێن با بڵێن، ئەوەی من دەمویست دەستم کەوت".

جا داواکارم وەك دکتۆر "مستەفا" نەبەز بیت لە سەر راستی. برا گیان دارایی‌و سامان نرخی نییە، پێشکەوتنی ماددی ئەگەر بڕوای لەگەڵ نەبێت گەورەترین ماڵوێرانییە بۆ ئادەمیزاد، ئەگەر کەمێك بە وردی سەیری ئەم ئادەمیزادەو هەڵپەی ئەم ئادەمیزادە بکەیت، بۆت دەردەکەوێت کە



پێشکەوتنی ماددیی زیاتر ئادەمیزادی خستۆتە ناخۆشیی‌و بێئارامی، نەك پشوودان، خاوەن سامان ئەوەیە دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا هەبێت لە پاشان هەوڵی کۆکردنەوەی ماڵ‌و سامان بدات، واتە بەندەی ئارەزوی خۆی نەبێت، هەر کەس دەسەڵاتی بەسەر خۆیدا هەبوو زانی رێگای راستی ژیان چۆنە، ئەوەیە بەگ، پاشا، پێشکەوتوو، خاوەنی ژیریی،... هتد، غاندی هیندی پیاوێکی روت‌و قووت بوو، بەڵام زۆر بە دەسەڵات بوو... ئەو رۆژەی کە دەیوت "بە رۆژوو دەبم و شت ناخۆم" دەوڵەتی ئینگلیز — کە یەکەم دەوڵەت بوو ئەو کاتە لە سەر رووی زەوییدا — لەرزی لێدەهات‌و کۆنگرەی گشتی "مجلس العموم" ی بۆ دەبەست‌و دەکۆڵرایەوە لە داخوازییەکانی "غاندی"، بەریتانیا وای دەزانی "غاندی" بە رۆکێتێکی ئەتۆمیەوە دەدا بەسەر "لەندەن" دا، لەگەڵ ئەوەشدا غاندی نانی ئێوارەی نەبوو تێر سکی خۆی بخوات، ئەوەیە دەسەڵات، ئەوەیە سامان کە هەرگیز نامرێت نەخۆی‌و نەسامانەکەی، بەڵام کۆشك‌و ئۆتۆمبیل، ئافرەتی جوان هەموویان دەمرن‌و دەسوون‌و ناویشیان نامێنێت.

گیانەکەم: لە کتێبێکدا خوێندمەوە کە لە یەکێك لە شارەکانی ئەمەریکا (٤١٨) تەرم گوێزرانەوە بۆ گۆڕ، ئەوانەی



لەگـەڵ تەرمەکانـدا بـون دەمو لوتیـان بـە ئـامێری کیمیـاوی هەڵبەستبوو، بەرگی کیمیاوییان لەبەر بوو هـەموو شـەقامەکان چـۆڵ کرابـون و هاتوچـۆش قەدەغـەکرا بـوو، ئەوانـەی لەگـەڵ تەرمەکانـدا بـون لـە ترسـان هەڵدەلـەرزان؟! بـەڵێ بـەو جـۆرە تەرمەکان گوێزرانەوەو چوونە گۆڕەکانیانـەوە کـە بنـی دەریـای "پاسەفیك" بوو. ئەم تەرمانە بریتیی بـون لـە (٤١٨) سـنوقی پۆلا، هەریەکەیان (٣٠) رۆکێتی گازی کوشندەی تێدابوو. واتـە زیاتر لە (١٢) هەزار رۆکێتـی دژە مـرۆڤ... بـەڵێ خزانـە بنـی دەریا، چونکە ئەمریکا بڕیاری دابـوو لـە دەسـتیی ئـەم جـۆرە چەکانە رزگاری ببێت، نـەك لەبەرئـەوەی حـەزی لـە ئاشـتییەو نایەوێ کەسـیان پـێ بکوژێـت، بـەڵکو لەبەرئـەوە بـوو چـەکی میکرۆباوی دروسـتکردوە، واتـە میکـرۆب پـەروەردە دەکـاتو دەیکات بە چەكو دەیتەقێنێ بۆ کوشتنی ملیۆنـەها کـەس بـە یەك چرکە، چونکە مۆدێلی تازەتری داهێناوە بۆ کوشتنو چـەکی "تۆلاریا" ی دروستکردوە، بەڵێ ئەو رۆکێتانەی فڕێدا، چـونکە چـەکی هایـدرۆجینی هەیـە لـە نـاو مـانگی دەستکردداا بـە تەقینەوەی کەرت "قـارة" یـەکی زەوی دەکـات بـە دەریایـەکی تـازە، چـونکە بـە تەمایـە بـەم زوانـە بۆمبـای "نیـوترۆن"



دروستبکات کە هەر بە تەقینەوەی گۆی زەوی هەروەك سێویك لەت دەکاتو دەیکات بە دوو پارچەوە، هەڵگرتنی تەرمی ئەو رۆکێتانەو فڕێدانیان، مانای فڕێدانی بەزەیی، مانای رزگار بون لە دەستی دڵنەرمیی.. ئا بەم جۆرە هەوڵ دەدرێت بۆ لە ناوچوونو قەڵاچۆکردنی ئادەمیزاد لە ماوەیەکی کەمدا، بێ ئەوەی هیچ سەربازێك بڵێ من ئازا بووم یان کوژراوێك بڵێ من شەهیدم... نا ئەمانە نامێنێت.

بەڵێ بەو جۆرە مرۆڤ بوو بە دوژمنی گرۆی مرۆڤایەتی، ئەمەیە ئەنجامی پێشکەوتنی ماددی.

کاکە گیان: پێش ئەوەی نامەکەم کۆتایی پێبهێنم، نەك تەنیا بە تۆ، بەڵکو بە هەموو نەوی ئادەمیزادی رادەگەیەنم و دەڵێم کوڕینە من مردوو و ئێوە زیندوو ئاگادارین... ئەوەی سواری فڕۆکە دەبێت پێی دەڵێن: "بە پشتێنی کورسییەکە خۆت ببەستەوە"، ئەم ئاگادارییە لەبەرئەوە نییە فڕۆکەکە بەرز دەبێتەوە، بەڵکو بۆ کاتی دابەزینو نیشتنەوەی فڕۆکەکەیە.

ئێمەیش وا تەواو بەرز بوینەتەوەو ئێستا نۆرەی دابەزین، بەڵکو داکەوتنە، بۆیە دەڵێم ئاگادارین، نیشانەی راستی ئەم ئاگادارییەم زۆرە، کوشتنی بە کۆمەڵ لە نەیجیریا، جەنگی



فەلەستین، دروست بونی ئیسرائیل، کێشەی قوبرس، گیروگرفتی نەوت، قڕی خواردەمەنی، تەقاندنی چەکی ئەتۆمی لە ژێر زەوی‌و ژێر دەریا، هەڵدانی ڕۆکێت بە بەهێزترین چەکی کوشندەو خولانەوەی بە دەوری زەویدا، مرۆڤی دڕندە، دڕندەیەك نینۆکەکانی ئەتۆمی‌و گازی کوشندەو ماسولکەکانی "ئوستۆڵ"ە... هتد.

شارستانێتی ماددی، زانستی لە ڕێرەوی خۆی لادا، بەڵکو زانستی کرد بە چڕنۆك‌و نینۆك‌و قەپ بۆ گیانی زاناکان.

بە ڕاستی پێشکەوتنی ماددی شکا، وا خەریکە لەو سەرەوە دەکەوێتە خوارەوە، ئابەم جۆرە کەمدەستی ماددی دەرکەوت، چارە نییە بۆ ئادەمیزاد تەنیا گەڕانەوە نەبێ بۆ باوەڕ بە گیان‌و هەستی گیانی‌و پەنا بردن بۆ ئەوەی ماددەی دروستکردوە‌و بۆی ڕاهێناوین، بەڵکو بمانپارێزێت لە جەنگی ماددە‌و ماددە پەرستان... بە گەڕانەوە بۆ فەلسەفەی گیانی، زانست زیاتر پەرە دەستێنێ‌و شارستانییەتی گەشەدارتر دەبێت‌و مرۆڤ دڵنیاتر دەبێت... بەڵام ئەمە دەبێ لە کوێوە دەست پێ بکات؟ لە من‌و تۆوە.. ئای ئادەمیزاد چەند ئاتاجی فەلسەفەی گیانییە.



ئیتر سڵاو و ڕێزم بۆ هەموو هاوەڵەکانت،

برات م. شارەزووریی لە هەولێر

سلێمانی ١٩٧٥/٢/٢٦



بـۆ نوسـینەوەی ئـەم نامیلکەیـە کـەڵك لـەم کتێبانـە وەرگیراوە:

| ناوی کتێب | دانەرەکەی |
|---|---|
| القران الکریم. | |
| ١ـ فی ظلال القران............................... | سیدقطب |
| ٢ـ تەفسیری خاڵ (بەرگی یەکەم)... | مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ |
| ٣ـ قصة الایمان........................... | الشیخ ندیم الجسر |
| ٤ـ روح الدین الاسلامی........................ | عفیف طبارة |
| ٥ـ الله.................................. | د. مصطفی محمود |
| ٦ـ الشیطان یحکم.......................... | د. مصطفی محمود |
| ٧ـ رأیت الله.............................. | د. مصطفی محمود |
| ٨ـ الجغراقیة الطبیعیة.................... | للصف الخامس الأدبي |
| ٩ـ العلم یدعو للایمان ......................... | د. کریسون |
| ١٠ـ المادة بین الأزلیة والحدوث ........ | الشیخ محمد حسن آل یاسین. |




# المصادفة فى ميزان المنطق

محمد ملا صالح الشهرزوري

من مطبوعات المجمع العلمي الكردي
مطبعة المجمع العلمى الكردي بغداد — ١٩٧٦

